حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پەروەردەی ئیسلامی و ئاییناسی

## پۆلی یانزەمی ئامادەیی

ئامادەکردن و پێداچوونەوەی زانستی
لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

چاپی یەکەم
١٤٣٦کۆچی - ٢٠١٥ زایینی - ٢٧١٥کوردی



# پێشەکی

ماموستایانو قوتابییانی خۆشەویست، ئەمەی لەبەر دەستاندایە پرۆگرامی بڕیار لەسەر دراوی بابەتی (پەروەدەی ئیسلامیو ئایینناسی) یە بۆ پۆلی یانزەمی ئامادەییو قۆناغی دووەمی خوێندنی پیشەییو پەیمانگەکان، لە لایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، ئەم پرۆگرامە بە هەنگاوێکی گەورە لە بواری وتنەوەی ئەم بابەتە دەژمێردرێت، چونکە چەندەها ساڵە ئەم بابەتە لە ژێر باری پرۆگرامێکی کلاسیکی کۆنەوە دەناڵێنێت، کە نەیتوانی ئامانجی وتنەوەی ئەم بابەتە بپێکێت، بۆیە لە پاش ئەنجامدانی چەندەها لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە لایەن پسپۆڕانی ئەم بوارەوە، وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە پێویستی زانی پرۆگرامێکی نویٚ بۆ ئەم بابەتە دابڕێژرێت، کە بگونجێت لەگەڵ پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکان،و رێنیشاندەربێت بۆ قوتابییە خۆشەویستەکانمان لە ناسینەوەی راستی ئاینە پیرۆزەکەیان،و هەروەها زانیاریان لە سەر ئاینەکانی دیکەش هەبێت، بۆ دەوڵەمەند کردنی باری مەعریفیان، چونکە زۆربەی ئەم ئاینانە لە کوردستانو عیراق شوێنکەوتویان هەیە.

بە خوێندنو خوێندنەوەی بابەتەکان ئەوەتان بۆ رووندەبێتەوە کە بابەتەکان بەشێوازێکی هاوچەرخانە ئامادەکراونو دەخوازن دیدێکی کراوەو رۆشنو بیٚ گریٚو گۆڵ بۆ قوتابییان دروست بکاتو بیانپارێزێت لە تێگەیشتنی ناڕاستو کەموکورت دەربارەی ئیسلام وەك ئاینی زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگەکەمان.

هەروەها تازەگەری لە چۆنیەتی خستنەڕووی بابەتەکانیش کراوە، لە کۆتایی بابەتەکاندا کۆمەڵێك پێشنیارو گفتوگۆو پرسیار وروژێنراوە بۆ ئەوەی قوتابیانیش بەشداری لە دەوڵەمەند کردنی وانەکەدا بکەنو تەنها وەك ئەرکێکی قوتابخانەی خۆیان نەچنە پۆلەکانەوە بەڵکو مەبەستیان سود وەرگرتنو پەروەردەبوونو بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری خۆیان بێت، ئێمە دڵنیاین ئەم پرۆگرامە دەبێت بە یەکێك لە پرۆگرامە پێشکەوتووەکانی، نەك تەنها لە عیراق بەڵکو لە خۆر هەڵاتی ناوەڕاستیشو رۆڵی زۆر دەبێت لە بەرزکردنەوەی ناو و ناوبانگی هەرێمو بەرەو پێشبردنی رەوتی بیری چاکسازیی لە بواری فیکری ئیسلامیو پرۆگرامی ئاین لە ناوەندەکانی خوێندندا، هیوادارین ماموستایانیش وا سەیری ئەم بابەتە بکەن کە رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە پەروەردەکردنو پاراستنی شوناسی نەوەی نویٚو کردنەوەی ئاسۆی نویٚ بەڕوویدا هەر لەو

سۆنگەشەوە بە بایەخەوە بابەتەکانی بە قوتابییان بڵێنەوەو ئەرکی سەرشانیان لەم رووەوە جێبەجێ بکەن.وئەم چەند خاڵەش وەك رێنوێنیو ئاسانکاری دەخەینە بەر دیدی مامۆستایانی بەڕێز:

١ – دابەشکردنی بابەتەکان بۆ چەند وانەیەك، تەنها بۆ کار ئاسانی مامۆستایانە، ئەگەر وتنەوەو تەواکردنی بابەتکە بخوازێت ئەم دابەشکردنە تێپەڕێنێت ئاساییە.

٢ – مامۆستایان بۆ هەر وانەیەکی نوێ پێشتر داوا لە قوتابیان بکەن وەك ئەرك خۆیانی بۆ ئامادە بکەنو سەرەتا لە پۆلدا لە رێی هەندێك پرسیارەوە بەشداری وتنەوەی وانەکە بکەنو دواتر مامۆستا وانەکە شی بکاتەوە.

٣ – مەبەست لە نەهێشتنی لەبەرکردن دورخستنەوەی قوتابییە لە (تەلقین)و بێزاری، بۆیە نابێت لە تاقیکردنەوەکانیش پرسیاری قورس بهێنرێتەوە قوتابی پێ بترسێنرێت، چونکە مەبەست لەم وانەیە پەروەردەکردنی قوتابییە نەك ترساندنی.

٤ – سروشتی بابەتەکان وا دەخوازن مامۆستایانی بابەت بە باشی خۆیان ئامادە بکەن، کە گومانمان لە وەدا نیە کە ئەوانیش دەرك بەم مەسەلەیە دەکەن.

٥ – داواکارین لە بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکان بایەخ بەم بابەتە بدەن بە دەستنیشان کردنی مامۆستای پسپۆڕو لێهاتوو بۆ وتنەوەی بابەتەکە، چونکە سیاسەتی نوێی پەروەردەیی حکومەتی هەرێم بایەخدانە بە پەروەردە کردنی نەوەکانی ئەم هەرێمە.

٦ – پێویستە مامۆستایان بایەخ بدەن بەو پرسیارو گفتوگۆیانەی لە کۆتایی هەر وانەیەك دانراون لە کتێبەکە، بە مەبەستی جوڵاندنەوەی مێشکی قوتابیانو راهێنانیان لە سەر بیرکردنەوەو گفتووگۆو شیکردنەوە، کە بێگومان لەم کارە لە بابەتەکانی دیکەی خوێندنیش سوود مەند دەبن.

خودای گەورە پشتو پەنای هەمووان بێت.

سەرپەرشتیاری زانستی

## وانەی یەکەم

# بـــاوەڕناسـی

**باوەڕ (ئیمان):**

بـاوەڕ یـاخود (ئیمـان) هەسـتێکە لـە دڵـدا چەسـپیوە و شـوێنەوارەکەی لـە گوفتـارو ڕەفتـاری مرۆڤـی باوەڕداردا دەردەکەوێت.باوەڕ مەرجی وەرگرتنی کردەوەی چاکە و کلیلی کردنەوەی دەرگای بەهەشتە .

وشـەی (ئیمـان) لـە زمـانی عـەرەبی دا لـە ریشـە (أمن) ەوە هـاتووە کـە ئاماژەیـە بـەو ئـارامی و ئاسایشـە دەرونیەی مرۆڤ لە سایەی باوەڕدا هەستی پێ دەکاتو. ئاسایشی دەرونی بۆ مرۆڤ دابین دەکات و، تـرسو نائـارامی و دوودڵـی و دڵـە راوکێـی لـێ دوردەخاتـەوە و، بـەرەو کـەناری ئـارامی و خۆشـبەختی ڕێنوێنی دەکات. وشـەی (مؤمن) یـش لـە بەشـێ لـە ماناکەیدا ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە باوەڕدار دوای ئـەوە خۆی دەگات بە ئاسودەیی و ئاسایشی دەرونی ئەویش لە ڕێی خۆیەوە هەوڵ دەدات خەڵکانی تریش لەم نیعمەتـە بەهرەمەنـد بـن. هـەروەها لـە ژیانـدا کەسـێکە ئاسـودەیی و خێـرو خۆشـی بـۆ کەسـانی دیکـەو کۆمەڵگە دەوێت.

لە ڕوانگەی ئیسلامیشەوە ( ئیمان ) هەڵقولاوی بڕیاری ئازادی مرۆڤەکانە و بە زۆر ناسەپێنرێت هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:(( لَاۤ إِكۡرَاهَ فِی ٱلدِّینِ ... ))(البقرة٢٥٦).

واتە: زۆرکردن لە ئایندا نیە. هەموو کەس دەبێت بە ویستی خۆی ڕێگای باوەڕو خواناسیو باوەڕداری هەڵبژێرێت.

چونکە ئەگەر زانستو زانیاری بە تەنها ناسینی شتەکان بێت. ئەوا باوەڕ جگە لە ناسین(معرفة) –کە دیارە زۆر گرنگە چونکە قوڵترین باوەڕ لە ناسینێکی قوڵەوە سەر هەڵدەدات– پێویستی بە خۆشەویستی ئەو کەسەیە بۆ ئەو شتەی کە باوەڕیی پێیەتی، بۆیە دەبێت جگە لە (ناسین) دوو بنەمای دیکەش لە پەیوەندی بە باوەڕ بوونیان هەبێت، کە ئەوانیش بریتین لە:

ئ – خۆشویستن.

ب – پشت بەستن و(اعتماد) لەسەر کردن.

بەم شێوەیە باوەڕداری ڕاستەقینە تەنها باوەڕێکی وشکی عەقڵی بە خودا نیە، بەڵکو خودای گەورە لە ڕوانگەی ناوو سیفەتەکانیو بەو جۆرەی خۆی پێ ناساندوین دەناسێتو هەست بە گەورەییو نیعمەتو میهرەبانیو بەخششەکانی ئەو دەکاتو پەی پێ دەباتو، دەیشیکات بە شوێنی ڕاز و نیازی. هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت:((إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴿٣﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴿٤﴾)) (الانفال ٢–٤).

واتە: باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە کاتێك یادی خودا دەکرێتو ناوی ئەو دەبرێت دڵیان دادەخورپێتو ناسك دەبێت، وە کاتێك بەڵگەو ئایەتەکانی خودایان بەسەردا دەخوێندرێتەوەو باوەڕیان

بەهێزتر دەبێتو پشت بە خودای خۆیان دەبەستن. ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و لەو ماڵەی هەیانە دەبەخشن. بەراستی ئەوانە باوەڕداری راستەقینەن.لای پەروەردگاریان پلەو پایەیەکی بەرزو لێخۆشبوونو رۆزیەکی زۆری بێ منەتیان هەیە.

بۆ ئەوەی مرۆڤیش بگات بەم ئاستە لە چێژو سود وەرگرتن لە باوەڕ و بەرهەمە شیرینەکانی، دەبێت باوەڕەکە بەرەنجامی خواناسین بێتو لە دەرگای خۆشەویستییەوە بچێتە ناو باغی باوەڕو تێگەیشتنێکی راستو دروستی دەربارەی ئاینی خودای گەورە و رێگاکانی گەیشتن بە خوداو بەدەست هێنانی لێخۆشبون و یارمەتی دانی ئەو هەبێت.

لە ئایەتەکەوە روون دەبێتەوە باوەڕی راستەقینە جۆشو خرۆشێکی زۆر لە دڵو دەرونی خاوەنەکەیدا پەیدا دەکاتو.

هەروەها رونی دەکاتەوە کە یەکێك لە بەرهەمەکانی باوەڕو نیشانەیەك لەسەر قوڵیو ناوەڕۆکداری ئەو، ئەنجامدانی نوێژەکان بە گەرم و گوڕی.چونکە ئایەتەکە باس لە نوێژ بەرپا کردن دەکات کە مانای شۆڕشێکی رۆحی لێ دەخوێنرێتەوە. هەروەها وا لە مرۆڤ دەکات فێری بەخشینو هاوسۆزی دەربڕێت لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا بێت و تەنها بۆ خۆی نەژی.

لە قورئاندا کە باسی (باوەڕ) دەکرێت لە زۆربەی هەرە زۆری کاتەکاندا باسی کردەوەی چاکیشی بە دوادا دێت.

واتە قورئان بە گشتی باسی باوەڕداری چاکەکار دەکات ، ئەمەش پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان باوەڕ و کارو رەفتاری چاکی مرۆڤ دەردەخات، وە دەیسەلمێنێت باوەڕدار و چاکە خوازیو رەوشت بەرزی بە قوڵی بە ناو یەکدا چوونو بە ئاسانی لە یەکتر جیاناکرێنەوە، چونکە باوەڕدار باوەڕی بە ژیانو جیهانێکی دیکە هەیە کە تیایدا زیندو دەبێتەوە و لەوێدا لەسەر ژیانی ئەم جیهانەدا لێی دەپرسرێتەوە، تاقیکردنەوەشی لەسەر کاری باش ئەنجامدانو چاکەخوازبوونە، هەروەها (باوەڕ) سەرچاوەی چەندین هەستو سۆزی پاکەو ئەم هەستانەش مرۆڤ لەسەر چاکەخوازی هاندەدەنو چاکە کردن دەکەن بە بەشێکی جیانەکراوە لە کەسێتی باوەڕدار.

**پرسیار :**

١ – باوەڕ ( ئیمان ) چییە ؟

٢ – باوەڕداری راستەقینە کێیە ؟

٣ – باوەڕ چ پەیوەندییەکی بە ئاسایشی دەروونیەوە هەیە؟

**گفتوگۆ :**

پەیوەندی باوەڕ و کردەوەی چاکە چییە؟



## وانەی دووەم

# باوەڕ و بەختەوەری

## رۆڵی باوەڕ لە بەختەوەرکردنی مرۆڤدا

بەختیاری بەو حاڵەتە دەوترێت  کە تیایدا مرۆڤ هەست بەخۆشی‌و  رەزامەندی دەرونی بکات‌و خەفەت بۆ رابردوو و ترس لە داهاتوو ژیانی لیّ ناخۆش‌و تاڵ نەکردبێت.

دیارە بەختەوەری ئەو ئامانجەیە کە هەموو مرۆڤێك هەوڵی بۆ دەدات‌و دەیەوێت لە ژیانیدا پێی بگات‌و خۆش بژی. مرۆڤ بە سروشتی خوداکردی خۆی لە ئازار و ناڕەحەتی و بەد بەختی‌و. ئیسلامیش هاتووە هەوڵی بەختەوەرکردنی مرۆڤ لە هەردوو دونیادا بدات.

بەڵام مرۆڤەکان لە دیاریکردنی هۆکارو سەرچاوەکانی بەختەوەریدا لەگەڵ یەکدیدا یەکسان نین و وەك یەك بیرناکەنەوە، هەندێك پێیان وایە بەختەوەری  لە دەوڵەمەندی‌و ماڵ‌و ساماندایە، هەندێکی دیکەش لە پلەو پایەو ناوو ناوبانگدا دەیبیننەوە ... هتد،

بەڵام ئایە ئەم بیرکردنەوانە راستن؟ ئایە هەموو دەوڵەمەندەکانی  جیهان  یاخود کاربەدەست‌و ئەستێرەو کەسە بەناوبانگەکان  لە ژیانیاندا بەختەوەرن؟ واقیع پێمان دەڵێت نەخێر، مەسەلەی بەختەوەری بەو جۆرە نیە، چونکە چەندین دەوڵەمەندو ئەستێرەی سینەمایی‌و هونەرو کاربەدەست‌و کەسی بەناوبانگ لەسەر زمانی خۆیان‌و لە یاداشت‌و وەسیەتنامەکانیاندا ئەوەیان خستۆتە روو کە لە ژیانیاندا  بەدبەخت و ناشاد بوون .

هەندێك لەوانەش لەبەر ئازاری دەروونی زۆر و نائومێدی و وەڕزبوونیان لە ژیان  پەنایان بردۆتە بەر خۆکوشتن ، نهێنی ئەم حاڵەتەش لەوەدایە کە بەختەوەری و هەست کردن بە رەزامەندی دەرونی  پێش هەر شتێك پەیوەندی بە ناوەوەی مرۆڤ و ناخ و دڵ و دەرونیەوە هەیە .

شوێنی راستەقینەی بەختەوەری دڵ و دەرونی مرۆڤە، هەر بۆیە مرۆڤ دەشێت بێ ئەوەی خاوەنی سەروەت و سامان و پلە و پایەیەکی  زۆرو بڵند بێت لە ژیاندا بەختەوەر بێت ، نموونەی کەسێك کە لەگەڵ ئەوەی هەموو پێداویستیە ماددیەکانی ژیانێکی خۆشی پێدراوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەست بە بەدبەختی‌و ناخۆشی دەکات وەك ئەوە وایە کەسێك زۆر تێنو بێت، بەڵام لە بری ئەوەی ئاو بخوات هەوڵ بدات بە ئاوکردن بەسەر خۆیدا تێنویتیەکەی بشکێنێت ، کە روونە بەم کارە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش تێنویتیەکەی کەم بێتەوە دادی نادات و دەبێت بۆ تێنوێتی شکاندنەکەی ئاو بخواتەوە، مرۆڤیش هەست بە بەختەوەری کردنی لە ناخیدایە وشتە رواڵەتی و ماددیەکان دەکرێت یارمەتیدەر بن، بەڵام بە تەنها ناتوانن بەختەوەری بکەن، بە واتایەکی دیکە لە روانگەی  ئیسلامیشەوە هەندێك مەسەلەی ماددی رۆڵیان لە بەختەوەر کردنی مرۆڤدا هەیە و نکوڵی لەمە ناکرێت هەروەك پێغەمبەر

(د.خ) دەفەرموێت :((من سعادة إبن آدم: المرأة الصالحة، والمسكن الصالح، والمركب الصالح)) پێشەوا أحمد ریوایەتی کردووە. واتە: لە بەختەوەری مرۆڤ چەند شتێکە: هاوسەری باش، خانووماڵی باش، هۆی گواستنەوەی باش.

بەڵام پێش هەموو ئەم شتانە دەبێت مرۆڤەکە خۆی خاوەن دڵو دەرونێکی باش بێتو لە دڵەوە هەست بە خۆشی بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی باشتریش سود لە هەموو نازو نیعمەتە ماددیەکان وەربگرێت وچێژێکی زۆرتریان لێ بەرێت، لە نامەی یەکێکدا کە پێش خۆکوشتنی نوسیبووی هاتووە:((**من گەنجێکم لەش ساغ و هاوسەرێکی بە دڵی خۆم هەیە و پارەیەکی زۆریشم هەیە هەرچی دڵم بیخوازێت لەبەر دەستمایە جا کە وایە ئیتر بۆچی بژیم**)).لەم روەشەوە ئاماژە بە چەندین خاڵ بکەین لەوانەش:

١- ئێمە بەهۆی باوەڕەوە بەسەرچاوەی ئەم بوونە و بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و خۆمان، واتە خودای پەروەردگار پەیوەست دەبین، مرۆڤێکیش باوەڕی بە خودای گەورە هەبێتو لە روانگەی ناوە پیرۆزەکانیەوە بیناسێت هەست بە تەنهاییو لاوازی و بێ کەسی و بێ پشتو پەنایی لا دەڕەوێتەوە و لە کاتی خۆشیو ناخۆشیو تەنگانەدا دەتوانێت پشت بە خودای میهرەبان ببەستێتو دڵی خۆی بۆ بکاتەوە و داوای کۆمەکی و یارمەتی لێ بکات. ئەمەش توانای رووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی ژیانی پێ دەبەخشێت و ناهێڵێت هاوسەنگی دەرونی تێکبچێت .

٢- مرۆڤ بەهۆی باوەڕەوە بەرچاوروون دەبێت و وەڵامی پرسیارە گرنگەکانی ژیانی دەست دەکەوێت لە وێنەی: لە کوێوە هاتووم ؟ بۆ هاتووم و ئامانج لەم ژیانەدا چییە ؟ بۆ کوێ دەگەڕێمەوە و چارەنووس دوای مردنم چییە ؟ مرۆڤ بە هۆی باوەڕەوە لە رێی قورئانەوە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەی دەست دەکەوێت، ئەمەش ئارامی پێ دەبەخشێت و هەست کردن بە بەدبەختی لا کەم دەکاتەوە.

٣- باوەڕ فێری چاکەکاریمان دەکاتو چاکەکارانیش لە سۆز و بەزەیی خوداوە نزیکن:((... إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ))(الاعراف ٥٦). واتە: بە راستی بەزەیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە، مرۆڤێکیش لە ژیانیدا هەست بە سۆزو بەزەیی خودای گەورە بکات زۆرتر هەست بە خۆشی ژیانو بەختەوەری دەکات .

٤- باوەڕ وامان لێدەکات خەفەت بۆ رابردوو نەخۆین و لە ئایندەش نەترسین، چونکە بۆ ئەوەی هەست بە بەختەوەری بکەین دەبێت لەو دوو هەستە رزگارمان بێت، لوتکەی بەختەوەریش لە بەهەشتدایە چونکە مرۆڤ نەخەفەت بۆ رابردووی دەخواتو نە لە داهاتووشی دەترسێت، ئەوەی پێی دەدرێت بۆ هەتا هەتاییەو نەمرە و هەرچیش دڵی بیخوازێت دەستی دەکەوێت.

٥ - ئێمە بەهۆی باوەڕەوە شوێن رێنوینیەکانی پەروەردگار دەکەوین، ئەویش بەڵێنی داوە هەرکەسێك بەو جۆرە بێت لە بەدبەختیو چارەڕەشی بەدوور دەبێت:((... فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ﴿١٢٣﴾

وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴿١٢٤﴾)) (طه ١٢٣-١٢٤). واته: هەرکەسێك شوێن ڕێنوێنی من بکەوێت نە گومڕا دەبێت و نە بەدبەخت، وە هەر کەسێکیش لە یادو ڕێبازی من هەڵبکات ژیانێکی پڕ ئازار و ناڕەحەتی دەبێت. چونکە باوەڕێکی ڕاستەقینە مرۆڤ لە نەخۆشیە دەرونیەکان دەپارێزێتو لە ژیانیشدا یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی بە جۆرێك بژێت مافی ڕۆحو جەستە و عەقڵی بداتو لە ژیاندا ئەرێنیو گەشبین بێت.

٦ – باوەڕ هانمان دەدات بۆ چاکەکردن و یارمەتیدانی کەسانی دیکە پێغەمبەر(د خ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت:((لە دوای باوەڕ بە خودا هیچ شتێك بە ئەندازەی خۆشی خستنە دڵی موسوڵمانێکەوە لای خودا بەنرخ نیە)) زانستی دەروونناسی و پەرەپێدانی مرۆیش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە یەکی لە ڕێگاکانی دەست کەوتنی بەختەوەری بریتییە لە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ بەختەوەر کردنی کەسانی دیکە.

د.یوری ریوریکوف لە کتێبی خۆشەویستی و وزەی دروونی دا دەڵێت:((ئەو یارمەتییەی مرۆڤ پێشکەشی کەسانی دی دەکات تەزوو لێشاوی هەستی باش و هەڵچونی پۆزەتیڤانەی پێ دەبەخشن کە دەرونو ڕۆحی بێگەرد دەکەنو خاوێنی دەکەنەوە و برینەکەی ساڕێژ دەکەنو هەستە تایبەتیەکانی بەرامبەر بە خۆی ساڕێژ دەکەنو هەستە تایبەتیەکانی بەرامبەر بە خۆی باشتر دەکەن و هەست کردن بە کەم و کوڕی و لە دەست دان لە دەرونیدا لاواز دەکەن)).

## پرسیار:

١ – بەختەوەری چییە و چۆن هەستی پێ دەکرێت ؟

٢ – بۆچی مرۆڤی باوەڕدار و تێگەیشتوو لە ژیان لە کەسانی دیکە بەختەوەر ترە ؟

٣ – ئایە بەختەوەری تەنها بە ماڵ و سامانو ناوبانگ و پلە و پایە بە دەست دێت ؟ بۆچی؟

## گفتوگۆ:

باوەڕ چ کاریگەریەکی لە بەختەوەر کردنی لاوانو کەمکردنەوەی کێشە دەروونییەکانیان هەیە ؟



## وانەی سێیەم

## باوەڕ و تێڕوانین بۆ بونەوەر و ژیان و مرۆڤ

ئـ – گەردوون لە دیدی باوەڕەوە:

یەکەم –

ئیسلام خاوەنی تێڕوانینی تایبەت بە خۆیەتی بۆ بونەوەر و ژیان و مرۆڤ کە لە هەندێك روەوە لە ئاین‌و بیروباوەڕەکانی دیکە جودای دەکاتەوە، هەرکەسێك قورئان بخوێنێتەوە هەست دەکات خودای گەورە بونەوەری کردوە بە کتێبێکی کراوە، مرۆڤ دەتوانێت لەرێی بیرکردنەوە لە دیمەن‌و بەڵگەو نیشانەکانی پەی بە مەزنی‌و تەواوی خودای گەورە بەرێت، یاساو راستییەکانی ئەم بونەوەرە بەڵگەن لەسەر وردەکاری‌و پتەوی‌و بەیەکەوە گونجانی بەش‌و پارچەکانی، قورئان سروشت‌و پێکهاتە وهەندێك لە تایبەتمەندییەکانی گەردونی باس کردووە، هەروەك هەندێك لە یاساکانی‌و ئامانج لە بەدیهاتنی‌و بنەڕەتی بەدیهێنانی رون کردۆتەوە:((إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)) (الاعراف٥٤) واتە: بە راستی پەروەردگارتان کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش رۆژدا بەدیهێناوەو دواتر لە سەر عەرش دانیشت، شەو دێنێت بەسەر رۆژداو هەریەکەیان دەڵێی پێشبڕکێ دەکات لەگەڵ ئەوی دیکەیاندا، هەروەها خۆرو مانگ‌و ئەستێرەکان سەرجەم ملکەچی فەرمانی ئەون، ئایە سەرچاوەی بەدیهێنان‌و فەرمانڕەوایی ئەم گەردوونە هەر ئەو نیە، پاکی بۆ ئەو خودایەی پەروەردگاری جیهانیانە.

دووەم –

کەواتە مەبەست لە بەدیهاتنی بونەوەر بەم جۆرەی ئێستا خزمەت کردنی مرۆڤ و دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیانیەتی:((... أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ...))(لقمان٢٠). لە روانگەی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە مرۆڤ دوای خودای گەورە سەرداری ئەم بونەوەرەیە، هەموو بەدیهێنراوەکانی دیکە تیایدا لە خزمەتی ئەمدان. بۆ ئەوەی لە رویەکەوە بتوانێت بە ئەرکی بەندایەتی بۆ خودای گەورە هەڵسێت‌و، لە رویەکی دیکەشەوە سود لە خێرو بێرەکانی وەربگرێت بۆ ئەوەی ژیانێکی خۆش گوزەرانی لەسەر بەرێتە سەر.

لە روانگەی ئەم بۆچوونەشەوە بۆ بوونەوەر و پێگەی مرۆڤ لە ناویدا ،مرۆڤ ملکەچی هیچ شتێك لە سروشتدا نابێت‌و لە دیاردە سروشتیەکان ناترسێت و لێکدانەوەی نازانستیان بۆ ناکات.

### سێیەم –

ئیسلام بۆچونێکی راستو دروستمان دەربارەی بوونەوەر پێ دەبەخشێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەم بونەوەرە خودایەکی هەیەو بەدیهێناوە و بە گوێرەی کۆمەڵێك رێساو یاسا رێکخراوەو کاردەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بونەوەر بابەت و شوێنی بیرکردنەوە و تێڕامانی زانستیو دۆزینەوەی نهێنیەکان و یاساکانیەتی . بۆ ئەوەی زیاتر خزمەتمان بکات. هەر لەم روانگەشەوە لە دیدی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە بوونەوەر دوژمنمان نیە، تاکو هەوڵدەین بە سەریدا سەرکەوین و تۆڵەی خۆمانی لێ بکەینەوە ، چونکە ئەو جۆرە تێڕوانینە دەبێتە هۆی ئەوەی ژینگە وێرانبکەین و سروشت لە سەرچاوەی خێرو بەخششەوە لە هەندێك روەوە بگۆڕێت بۆ سەرچاوەی هەڕەشەو ترس بۆ سەر ژیان و مرۆڤایەتی، هەروەك ئێستا بە هۆی زیادە ڕەوی لە پیس کردنی ژینگە بە هۆی خۆرئاواییەکانو هەندێك وڵاتی پیشەسازی دیکە مەترسی لەسەر چینی گازی ئۆزۆن دروست بووە و، کارەساتە سروشتیەکان بە جۆرێکی بەرچاو زیادیان کردووە. کە ئەگەر مرۆڤایەتی سنورێ بۆ ئەو خراپە مامەڵەکردنە لەگەڵ سروشتدا دانەنێت ، ئەوا دەبێت چاوەڕێی خراپەی زیاتر بکات، سروشت و بونەوەر لە روانگەی جیهانبینی یەکتاپەرستی و بیروباوەڕی ئیسلامییەوە وەك پیشانگایەکی رازاوەی خودایی وایە و، مرۆڤ دەبێت هەست بە نزیکیو خۆشەویستی بکات لێیەوەو لە پاڵ هەوڵدان بۆ سود وەرگرتن لە خێرو بێرەکانی هەوڵبدات جوانییەکەی نەشێوێنێت.

بۆئەوەی هەل و مەرجەکانی ژیان تیایدا بەردەوام بێت و پێشکەوتنی زانستیش لە هۆکارێکەوە بۆ خۆشتر کردنی ژیانی ئێمە ، نەگۆڕێت بە هۆیەك بۆ وێران کردنو مەترسی.

### چوارەم –

لە روانگەی ئیسلامەوە بوونەوەر ئامانجدارە و بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکراوە: ((وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ)) (ص ٢٧).

واتە:ئێمە ئاسمان و زەویمان بە بێ هودە و بێ ئامانج بەدینەهێناوە. بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە گومانی خوانەناسەکانە.

کەواتە ئەقڵی باوەڕدار لەوە تێگەیشتووە کە ئەم بوونەوەرە بێ ئامانج بەدینەهاتووە، چونکە کاری لەوجۆرە لە حیکمەتو زانست و دانایی بەدیهێنەرەکەی، کە خودای گەورەیە ناوەشێتەوەو دورە لێیەوە، لە بونەوەردا هەموو شتێك بۆ ئامانجێك بەدیهاتووە و ئەرکێکی هەیە ئەنجامی دەدات.

خودای گەورە ئەم مەسەلەیەمان لە قورئاندا لەسەر زمانی کۆمەڵێ باوەڕدارەوە کە لەو راستیەی سەرەوە گەیشتوون لە تابلۆیەکی پڕ لە هەست و گەرم و گوڕی و جوڵەدا بۆ دەخاتە روو دەفەرموێت: ((إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴿١٩٠﴾)) (آل عمران ١٩٠)

واتە: لە بەدیهاتنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی شەوو رۆژدا بەڵگە گەلێکی زۆر هەن بۆ مرۆڤە خاوەن

ئەقڵ و هۆشمەندەکان، ئەوانەی ئەقڵی خۆیان وەگەڕ دەخەن بۆ دۆزینەوەی راستییەکان. ئەم باوەڕدارانە کە لە ئامانجداربوونی بونەوەرەوە تێگەیشتوون، مرۆڤیش بۆ ئامانجێك بەدی هێنراوەو دەبێت بەو گیانەشەوە بژی وە دۆزینەوە و دەرك کردنی ئەو ئامانجەش لە رێی گوێ گرتن لە پەیامی خوداو سروشییەوە دەبێتو دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئێمە گوێمان لە بانگخوازێك بوو بانگەوازی دەکرد بۆ باوەڕ، داوای دەکرد کە باوەڕ بە پەروەردگارمان بێنین ئێمەش باوەڕمان هێنا، ئەی پەروەردگار، دە تۆش لە تاوان و هەڵەکانمان خۆش ببەو، چاوپۆشیمان لیّ بکە وە لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە و بمانبەرەوە بۆلای خۆت.

ئەی پەروەردگارمان، ئەو بەڵێنانەمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتەوە بە ئێمەت داوە، وە لە رۆژی قیامەتدا خەجاڵەت و روو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیتو بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر، خودای گەرەش پاڕانەوەکەی لیّ وەرگرتنو دڵنیای کردنەوە کە من کارو کردەوەی هیچ باوەڕدارێك ژن بێت یاخود پیاو تیانابەم و نافەوتێنم، ئێوە ژنان و پیاوانی باوەڕدار رێز و کەرامەتی وەك یەکتان هەیە و هەندێکتان لە هەندێکی دیکەتانن. هەروەهاخودای گەورە دەفەرموێت:(( وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ))(الأنبياء ١٦). واتە: ئێمە ئاسمانو زەویمان بۆ گاڵتە و بێ ئامانج بەدینەهێناوە. کەواتە ئەگەر مرۆڤ بە گوێرەی رێبازێکی دروستو بە جوانی ئەقڵی بەکار هێناو بیری لە سروشتو ئاسمانەکان و زەوی و بەڵگە و نیشانەکانی خودای گەورە کردەوە، دەگاتە ئەو راستیەی کە بوونەوەر ئامانج دارە و هەست بە حیکمەتو وردەکاریو دەست رەنگینی پەروەردگار لەم بونەوەرەدا دەکات.

**پرسیار :**

١ – ئایە لە بەدیهاتنی بوونەوەردا هیچ ئامانجێك هەیە ؟ ئەگەر هەیە چییە ؟

٢ – كاتێك خودای گەورە دەفەرموێت ئێمە بوونەوەرمان بێ هودە بەدینەهێناوە واتای چی دەگەیەنێت؟

٣ – پەیوەندی نێوان ئامانجداربوونی بوونەوەر وژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویەدا چییە ؟

٤ – پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بوونەوەر لە روانگەی ئیسلامەوە چییە ؟

**ئەرك :**

بوونەوەر چەندەها بەڵگەی تێدایە كە نیشانی دەدەن خودای گەورە بەدیهێنەری بوونەوەرە و بێ هودەش بەدی نەهێناوە ، چەند بەڵگەیەك لەوانە بنوسە ؟

**گفتوگۆ :**

خودای گەورە بوونەوەری خستۆتە ژێر دەستی مرۆڤەوەو ملكەچی ئەوی كردووە، ئەمە چ كاریگەریەكی بەسەر بیركردنەوەو ژیانی مرۆڤ و كۆمەڵگەوە هەیە ؟

## وانەی چوارەم

### باوەڕو راستی پشت بەستن بە خودای گەورە

دەتوانین پێناسەی پشت بە خودابەستن بەم جۆرەی خوارەوە بکەین : بریتییە لە متمانەی بەندە بە خودای گەورە و سپاردنی کاروبارەکانی بە ئەوو باوەڕکردن بە کارسازی و کۆمەکی و لا لێ کردنەوەی بۆ بەندەکانی، ئەمەش ئەوە دەردەخات پشت بەستن بە خودای گەورە هەڵقوڵاوی دڵی باوەڕدارەو سەرچاوە لەو متمانەوە وەردەگرێت کە مرۆڤ بە پەروەردگاری خۆی و جیهانیان هەیەتی. چونکە پشت بە خودا بەستن یەکێکە لە بەرهەمە شیرینەکانی باوەڕ بە خودای گەورە و ناسینی سیفەتەکانی.

### باوەڕدارانیش پشت بە خودای خۆ دەبەستن

واتە پشت بە خودا بەستن بە یەکێك لە نیشانەکانی باوەڕداربوون دەژمێردرێت، هەروەك دەفەرموێت:((... وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ)) (المائدة١١) واتە: با باوەڕداران تەنها پشت بە خودا ببەستن.

### پشت بە خودا بەستن و هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ

ئەم باسە یەکێکە لە گرنگترین باس و بابەتەکانی پەیوەست بە مەسەلەی پشت بە خودا بەستن و هەر لە رابردووەوە زانایان قسەی زۆریان لە سەر کردووە، ناوەڕۆکی مەسەلەکەش ئەوەیە کە داخۆ پشت بە خودا بەستن و کار سپاردن بە خوداو متمانەی دڵ بە کۆمەکی و رەحمەتی پەروەردگار، لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشان و نەخشە کێشان و سود وەرگرتن لە ئامراز و هۆکارە سروشتی و ماددیەکان ناکۆکە؟؟

لە راستیدا بە تێڕامان لە قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام(دخ)و هاوەڵان و شوێنکەوتوان و پیاو چاکان زۆر بە ئاسانی لەوە تێدەگەین کە نەخێر ئەم دوو شتە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ یەکدا ناکۆك نین، بەڵکو تەواوکەری یەکترن و هەریەکەیان باس لە رویەکی کار و چالاکی مرۆڤی باوەڕدار دەکات. خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت:(( وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى)) (النّجم٣٩) واتە: مرۆڤ جگە لە بەری هەوڵ و تێکۆشانی خۆی نابێت چاوەڕوانی هیچی دیکە بێت.

خودای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەریش(دخ) دەربارەی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دەفەرموێت: ((... وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ ...)) (آل عمران١٥٩)، واتە: راوێژ بە هاوەڵانت بکەو مەسەلەکانیان لە گەڵدا تاوتوێ بکە دوای ئەو پرۆسەیەو گوێ گرتن لە را جۆراوجۆرەکان و باس کردن لە ئەگەرەکان و گەیشتن بە بڕیار، جا پشت بە خودا ببەستە، سەیر دەکەین لێرەدا پشت بە خودا بەستن کەوتۆتە دوای دوو قۆناغ بۆ دروست کردنی بڕیارێکی راست و دروست پێویستن، هەروەها پێغەمبەر (دخ) لە وەڵامی پیاوێکدا کە گوتی: من وڵاخەکەم بەڕەڵا دەکەم و پشت بە خودا دەبەستم، ئەو بۆچوونە هەڵەیەی دەربارەی پشت بە خودا بەستن بۆئەو و سەرجەم باوەڕداران راست کردەوە و

فەرمووی:((اعقلها ثم توكل على الله)) واتە: بیبەستەرەوە جا پشت بە خودا ببەستە. کەواتە هەستی پشت بە خودا بەستن جگە لەوەی لە ناو دڵەوە هەڵدەقوڵێت لە ناو جەرگەی هەوڵ و تێکۆشان‌و نەخشەکێشانەکانیشەوە سەرچاوە دەگرێت.

چونکە خودای گەورە گەردونی بە گوێرەی کۆمەڵێك یاسا و رێسا (السنن الكونية) بەڕێوە دەبات‌و بۆ کەس نایانگۆڕێت، بۆ نمونە: توانای سوتانی بە ئاگر بەخشیووە ئەم توانایەشی بۆ باوەڕدار و بێ باوەڕێك وەکو یەك وایە، واتە هەروەك چۆن بێ باوەڕێك دەسوتێنێت وەها باوەڕداریش دەسوتێنێت، تەنها بە ویستی خودا نەبێت، وەك بۆ پێغەمبەری خودا (ئیبراهیم) (د.خ) ئاگر ساردکرا.

## ئاسەوار و بەرهەمەکانی پشت بە خودا بەستن

گومانی تێدا نیە پشت بە خودا بەستن شوێنەوار و ئاسەوارێکی گەورە بە سەر رەهەندە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤی باوەڕدارەوە دادەنێت‌و بەجێ دەهێڵێت . کە لە خوارەوە بە کورتی ئاماژە بە هەندێك لەو ئاسەوارو بەرهەمانە دەکەین :

١ – پشت بە خودا بەستن و خۆڕاگری لەبەردەم کێشە و گرفتەکاندا :

لەو روەوە کە پشت بە خودا بەستوانی باوەڕدار بەرەنجامی کاری خۆیان بە خودا دەسپێرن، خودایەك کە لە هەمووو شوێنێك ئامادەیە و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە . یەکەمین بەرهەمی ئەم قەناعەت و باوەڕە پشت بە خۆ بەستن و خۆڕاگری دەبێت لە بەردەم کێشەو گرفتەکانی ژیاندا، مرۆڤ کاتێك هەست دەکات لە بەردەم کێشەکاندا تەنها نیە و خودای گەورەی لەگەڵدایە و دەتوانێت هاواری بۆ ببات و پشتی پێ ببەستێت و داوای خۆڕاگری و کۆمەکی لێ بکات، هەست بە لاوازی و شکستی لا دەڕەوێتەوە و لە بری ئەوەی خۆی بە دەست رەشبینی‌و هەست کردن بە بێ تواناییەوە بدات، بە پشت بەستن بە خودا درێژە بە برینی رێگای ژیان دەدات‌و لە بەرامبەر فشار و ناڕەحەتیەکاندا بەرهەڵستی دەکات‌و، دەشزانێت لەگەڵ تەنگانەدا رزگابوونی. ((... وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ...)) (الطلاق٣).ئەوەی پشت بە خودا ببەستێت، خودای بەسە. ((وَمَا لَنَا أَلاَّ نَتَوَكَّلَ عَلَى اللهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ)) (ابراهيم١٢). واتە: دەبێت چی وامان لێ بکات پشت بە خودا نەبەستین لەکاتێکدا ئەو رێنوێنی رێگاکانی کردوین وە ئارام بگرین لە سەر ئەو ئازارانەی دەمانەدەن دەبا ئەوانەی دەیانەوێت پشت بە یەکێك ببەستن پشت بە خودا ببەستن.

لە بەرامبەر فشارەکانیشدا سرودی جاویدانی نەمری باوەڕداران لە درێژایی مێژوو تارۆژی دوایش بریتییە لە:((...حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ...)) (آل عمران١٧٣) واتە: خودامان بەسە بۆ پشتیوانیمان و ئەو باشترین پشتیوان و کارڕاسایە.

٢ – هەست کردن بە هێز و توانای بڕیاردان : مرۆڤ کاتێك بڕیاری دا پشت بە خودای گەورە ببەستێت، لە حاڵەتی دوودڵی و ڕاڕایی دەردەچێت و رزگاری دەبێت، ئومێدی بە کۆمەکی خودا لا پەیدا دەبێت

چونکە یەکێك لەو شتانەی ناهێڵێت مرۆڤەکان لە کاتی پێویستدا بڕیار بدەن هەست بە نەبوونی پشتیوانی و ئەگەری شکست و هەست بە بێ توانایی کردنە. لەحاڵەتی پشت بە خودا بەستندا مرۆڤ هەست دەکات کە خودا یارمەتی دەدات و پشتی دەگرێت، لێرەشەوە بە ئازایەتی و جورئەتەوە هەنگاو دەنێت و لەکاتی پێویستدا بڕیار دەدات.

هەروەها پێغەمبەر(دخ) بە (ئیبن عباس) ی فەرموو :((استعن بالله و لا تعجز)) پشت بە خودا ببەستەو خۆت بە لاوازو بێ تواناو هیچ لەبارانەبوو نیشان مەدە. کەسێك پشتی بە دەستەڵاتێکی بێ سنور ببەستێت لەم گەردونەدا کە هەموو شتێکی لەبەر دەستدایە چۆن دەبێت هەست بە هێزی خۆی نەکات ؟

٣ – بەدەست هێنانی خۆشەویستی خودا : یەکێکی تر لە ئاسەوارەکانی پشت بە خودا بەستن ئەوەیە کە خودای گەورە ئەو باوەڕدارەی خۆش دەوێت پشتی پێ دەبەستێت و متمانەی خۆی پێ دەبەخشێت: ((... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)) (آل عمران ١٥٩) واتە : بێگومان بن کە خودای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن. دیارە دەست خستنی خۆشەویستی خوداش بۆ باوەڕدار سەرمایەیەکی یەکجار بە نرخە.

٤ – نەمانی دەستەڵاتی شەیتان بە سەرکەسی پشت بە خودا بەستووەوە، مرۆڤەکان بەو ئەندازەی (باوەڕ) و (پشت بە خودا بەستن) یان هەبێت، بە هەمان ئەندازە لە دەستەڵاتی شەیتان رزگاریان دەبێت و دور دەکەونەوە، سەرەنجام لە لادان و خراپە کردنیش دەپارێزرێن، خودای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت:(( إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ )) (النحل٩٩) واتە: بە دڵنیاییەوە شەیتان دەستەڵاتو توانای بەسەر ئەوانەدا نیە کە باوەڕیان هێناوە و پشت بە خودا دەبەستن.

شەیتان لە کاتێکدا دەتوانێت بەسەر مرۆڤدا زاڵ بێت کە پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە لاواز بووبێت و بە دوای هەواو ئارەزوی خراپی خۆی کەوتبێت، بەڵام ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ خوادا بەهێز بێت و پشتی پێ ببەستێت لە فێڵ و خراپەکانی شەیتان بەدور دەبێت.

٥ – ئاسودەیی و ئارامی دڵ: یەکێك لە ئاسەوارەکانی (پشت بە خودا بەستن) ئارامی و ئاسودەیی دڵە، پشت بە خودا بەستن تۆوی ئومێد لە دڵدا دەڕەوێنێتو زەمینەی رزگاربوون لە فشاری دەرونیو دڵەڕاوکێو پەرێشانی فەراهەم دەکات، چونکە هۆکاری سەرەکی فشارو دڵتەنگی لە مرۆڤدا لێکدانەوەی نادروستی مرۆڤە بۆ روداو و پێشهاتەکانی ژیانو هەست کردن بە بێ توانایی و تەنهایی وە لەلایەکی دیکەوە مرۆڤ کاتێك پشت بە خودا دەبەستێتو باوەڕی بە داد پەروەری و میهرەبانی و توانای ئەو هەیە ئەمە ئارامو دڵنیای دەکات .

مرۆڤ کاتێك پشتی بە خودا بەست، هەست بە تەنهایی ناکاتو، لە هەموو ساتەکانی ژیانیدا هەست بە بەزەییو میهرەبانیو چاودێری پەروەردگار دەرهەق بەخۆی دەکاتو پەیوەندییەکی گەرمو گوڕ بە خودای گەورەی دەبەستێتەوە، لێرەوە فشارو دڵتەنگی و پەستی لە ژیانی دا بە بەراورد لەگەڵ

کەسانی دیکە کەمتر دەبێت و بە چاوی گەشبینییەوە دەڕوانێتە ژیان، هەروەها ئەگەر سەرچاوەیەکی دیکەی خەفەتو نیگەرانی مرۆڤ پشت کردنی هەندێك لە مرۆڤەکانو بە تایبەتیش مرۆڤە خراپەکان و ئازاردانی ئەوان بێت، ئەوا باوەڕو پشت بە خودا بەستن وای لیّ دەکات هەڵنەچێتو زۆر خەفەت نەخوات و ئەم باش بێ و ئەوەکەی دیکەش بە خودا بسپێرێت خودای گەورە لەم روەوە بە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت:((... فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً)) (النساء٨١) واتە: گویّ مەدە پێیان (دووڕووەکان) و لە نەخشەکانی ئەوان ترس و بیم دات نەگرێت، پشت بە خودا ببەستە بەسە ئەو پشتیوان و بەرگریکارت بێت.

**پرسیار :**

١ – جیاوازی نێوان پشت بە خودا بەستن و پشت لێکردنەوە (تواکل ) چییە ؟

٢ – پشت بە خودا بەستن لەبەردەم کێشەکاندا چ بەرهەستێکی بۆ باوەڕدار هەیە و پشت بە خۆ بەستن چییە و چ پەیوەندییەکیان بە یەکەوەیە؟

٣ – بۆ دەبێت لە ژیاندا پشت بە خودا ببەستین ؟

٤ – ئایە مرۆڤ تەنها لە کاتی تەنگانەدا پشت بە خودا دەبەستێت ؟

**گفتوگۆ :**

پەیوەندی نێوان پشت بە خودا بەستن و هەستکردن بە سەربەرزی چییە ؟

## وانەی پێنجەم

# پشت بە خودا بەستن و پشت بە خۆ بەستن

وەك باسكرا قورئانو رێنوێنییە ئیسلامیەكانی دیكە هانمان دەدەن پشت بە خودا ببەستین، لە كاتێكدا زانا دەروونناسەكان مرۆڤ رێنوێنی دەكەن پشت بە خۆی ببەستێت، وە ئەمەیان بە یەكێك لە خەسڵەتە ئیجابیەكان لە قەڵەم داوە، بە جۆرێك كە لە رێی متمانە بەخۆبوونو پشت بە خۆ بەستن مرۆڤ دەتوانێت رێگەی پڕ لە هەوراز و نشێوی ژیان ببڕێت و بە لوتكەی بەختەوەری بگات.

بە بڕوای دەروونناسەكان پشت بە خۆ بەستن بناغەی هەموو رزگاری و پێشكەوتنێكە، بە پشت بە خۆ بەستن ئیرادەی مرۆڤ بەهێز دەبێتو بە پشت بەستن بە غەیری خۆشی بێ هێزو لاواز دەبێت. ئەو یارمەتیەی لە كەسانی ترەوە پێی دەگات زۆر جار دەبێتە هۆی سستو خاوكردنەوەی مرۆڤو وای لێ دەكات لە هەوڵو كۆشش بەردەوام نەبێت.

گەر بە رواڵەت سەیری ئەمە بكەین وا دەردەكەوێت كە پشت بە خۆ بەستن، لەگەڵ پشت بە خودا بەستن ناكۆكە و لەگەڵ یەكدا كۆنابنەوە، وە مرۆڤێك كە پشت بە خودا ببەستێت ئیتر ناتوانێت پشت بە خۆی ببەستێتو كارەكانی بداتە ئەوو چاوەڕێی كۆمەكی لێ بكات، یاخود پشت بە خۆی ببەستێتو هەوڵبدات خۆی ئەنجامیان بداتو پشت بە توانا و وزەكانی خۆی ببەستێت.

بەڵام ئەگەر تێگەیشتنێكی راستو دروستمان بۆ پشت بەستن بە خودا هەبێت و جیای بكەینەوە لە پاڵدانەوەو تەمبەڵیو ناكارایی، وە وەك باس كرا دوای هەوڵی بەدەست هێنانی هۆكارو پێداویستییە ماددیەكانو فەراهەم كردنی مەرجەكانی سەركەوتن بێت، وە پشت بە خۆ بەستنیش گەر بە پشت بەستن بە وزەو تواناكانی مرۆڤ خۆی بزانین، ئەوا هەموو خراپ تێگەیشتنێك لەم رووەوە لادەچێت؛ چونكە باوەڕدار باوەڕی وایە هەموو ئەو وزە و توانایەی بە مرۆڤ بەخشراون سەرچاوەكەی خودای گەورەیەو بۆ ئەوەش پێی داوە كە لەسەر پێی خۆی بوەستێتو چاوی لە دەستی كەسانی دیكەوە نەبێتو سەربەرزانە بژی.

بەم جۆرە پشت بە خۆ بەستن نەك هەر لەگەڵ پشت بەخودا بەستن ناكۆك نابێت، بەڵكو دەبێت بە یەكێك لە رەهەندە گرنگەكانی ئەوو بەرەنجامەكانیو وای لێ دێت كە لە رێی سود وەرگرتن لەو وزەو توانایەی خودا پێی بەخشیوین، ئازایانە روبەرووی ژیان ببینەوەو هەوڵی سەركەوتن بدەین، نەك بە نیازی كەسانی دیكە پاڵی لێ بدەینەوە و بێ دەستەڵات لێ ی بكەوین. كەواتە پشت بە خودا بەستن هێز و گورژمێكی گەورەتر دەدات بە پشت بە خۆ بەستنی مرۆڤ و ئەو هەستەی كە پێی وایە خودایەك هەیە كۆمەكی دەكات و دەتوانێت پشتی پێ ببەستێت، هەست كردن بە هێز و گەورەیی زۆرتر لە مرۆڤدا دەروێنێتو وای لێ دەكات زیاتر بڕوای بە خۆی و وزە وتواناكانی بێتو، لە هەمووحاڵەتێكدا سوپاسی

خودا بکات لە سەر دەست کەوتو سەرکەوتنەکانو لە سەر ناڕەحەتیو کۆسپەکانی ڕێگەش ئارام بگرێتو نەبەزێتو هەوڵبدات بە سەریاندا زاڵ بێت.

## باوەڕ و نزا و پاڕانەوە

نزاو پاڕانەوە بەرهەمی باوەڕ بە خودا و ناسینی زاتی پەروەردگارە، نزا هۆی بەرز بوونەوەی گیانی مرۆڤی باوەڕدارە بەرەو خودا و چێژێکی گەورەو ئارامیو خۆشی بە دڵ و دەرون دەبەخشێت.

نزاش بریتییە لەوەی مرۆڤ داوای کۆمەکی لە خودای گەورە بکات بۆ دەستەبەر کردنی پێویستیو ئاتاجیە ماددی و مەعنەویەکانی.

## پایەکانی نزا و پاڕانەوە

نزا و پاڕانەوە چوار پایەی سەرەکی هەیە، بەم جۆرەی خوارەوە:

یەکەم –

داوا لێکراو: داوالێکراو لە نزادا خودای گەورەیە. خودایەك موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە: ((أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ)) (البقرة ١٠٧)دەستگیرۆیی و بەخششی ئەو بۆ بەندەکانی هیچ لە خەزێنە و موڵکی ئەو کەم ناکات. ((إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ)) (ص٥٤) واتە: دەبینی رزق و رۆزی هی ئێمەیەو تەواو بونیشی بۆ نیە.

گرنگە ئەوە بزانین کە خودای گەورە خۆی داوای لێ کردوین داواکاریەکانمان بۆ لای ئەو بەرز بکەینەوە و هاواری بۆ بەرین و لێی بپاڕێینەوە، هەروەك دەفەرموێت:(( وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)) (غافر٦٠) واتە: داوام لێ بکەن هاوارم بۆ بێنن وەڵامتان دەدەمەوەو دێم بە دەنگتانەوە، بە دەم داواکەتانەوە دێم، ئەوانەی بەرامبەر بە پەرستنی من خۆ بە گەورە دەگرن ( نزا ناکەن و داوام لێ ناکەن و خۆیان بە بێ نیاز لە خودا نیشان دەدەن ) بابزانن بە (داخرین) دوە دەخرێنە دۆزەخەوە.

هەروەها جارێکی دیکە ئاگادارمان دەکاتەوە کە پەروەردگارمان لە ئێمە زۆر نزیکە:(( وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ...)) (البقرة١٨٦) واتە: ئەگەر بەندەکانم داوا لە من بکەن و بپاڕێنەوە با بزانن من زۆر نزیکم لێیانەوە، و دەفەرموێت:((... وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ)) (ق١٦)

واتە: ئێمە لە ڕەگی بناگوێ لە بەندەکەمان نزیکترین. هەست کردن بەم نزیکیو لەگەڵ بوونەی خودای گەورەش متمانەو ئومێدێکی زۆرتر دەدات بە باوەڕداری نزاکار، کە لەم سارای بونەدا بە تەنها نیە و خودایەکی بەسۆز هەیە چاودێری دەکات و گوێ لە داواکانی دەگرێت.

دووەم –

نزاکار: بریتیە لەو باوەڕدارەی نزا دەکات و پێداویستیەکانی دەباتە لای خوداو داوای سۆزو بەزەیی لێ دەکات و بە راز و نیاز کردن لە گەڵیدا دڵ و دەرونی تینوی بە خۆشەویستی پەروەردگار ئاسودە و

تێر ئاو دەکات . خودای گەورە دەفەرموێت: (( يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ)) (فاطر١٥)، واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە ئاتاجی بارەگای خودانو خودای گەورەش بێ نیازو سوپاسکراوە.

مرۆڤ خاوەن هەرچی بێت لەم ژیانەدا بەرامبەر بە خودا هەژارەو پێویستی بە سۆزو رەحمەتو لا لێ کردنەوەی ئەو هەیە.

بەو ئەندازەی مرۆڤ هۆشیاری هەبێت لە رەحمەتی خودا نزیك دەکەوێتەوە، دیارە هەموو مرۆڤێك لە کاتی لێقەومان و تەنگانەدا دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا و داوای یارمەتی لێ دەکات، هەندێك لە زانایانیش ئەمەیان بە یەکێك لە بەڵگەکان لەسەر بوونی خودا داناوە. وە ئەوە دەسەلمێنێت (فطرة) و خۆرسکی مرۆڤ لە بنەڕەتدا رووی لە خودایە و لە هەندێك کاتدا سەرەڕای فەرامۆش کردنی دێتە زمان و گوزارش لە خۆی دەکات، لە رویەکی دیکەوە ئەمە ئەوە دەخاتە روو کە پەنا بردن بۆ خوداو هێزێکی باڵادەست لە مرۆڤدا غەریزەیە. لێرەوە ئەوەی گرنگە بۆ باوەڕدار ئەوەیە کە لە خۆشی و ناخۆشیدا خودای لە بیرنەچێتو پەیوەندی لەگەڵ خودای خۆی گەرم بێتو نزا بکات و بەندایەتی خۆی بۆ دەر ببڕێت.

سێیەم –

نـزا: بریتیە لەو داوا و دەربڕین و وتەو هەستە دەرونی و شێوازانەی مرۆڤ لە رێی ئەوانەوە پێویستیو داواکارییە مادديو مەعنەویەکانی دەباتە لای خودای گەورە.

دیارە مرۆڤ تا پێداگرتووتر گەرموگوڕتر بێت لە نزاکردندا زیاتر جێگەی لوتفو رەحمەتی خودایە، چونکە نیشانەی باوەڕو متمانەو دڵخۆشی ئەوە بە پەروەردگار.

چوارەم –

نزا بۆ کراو: بریتیە لە هەموو ئەو پێداویستیو ئاتاجیانەی مرۆڤ داوا لە خودای گەورە دەکات بۆی دابین بکاتو بێ بەدەمیەوە و ئاوڕی خێری لێ بداتەوە.

مرۆڤ دەتوانێت هەموو شتێك لە خودای گەورە داوابکات بە هەندێك مەرجەوە کە دواتر باسیان دەکەین، شتێك هەرچەند زۆر و گەورە بێت بۆ دەستەڵات و موڵکی خودای گەورە هیچ نیە.

## شوێن و بایەخی نزا و پاڕانەوە لە ئیسلامدا

ئیسلام بە سیفەتی پەیامێکی ئاسمانی و ئاینێکی خودایی و بانگەشەکەری مرۆڤەکان بۆ خوداناسین و یەکتا پەرستی بایەخێکی یەکجار زۆری داوە بە نزاکردن و پاڕانەوە، چونکە نزا نوێژی دڵە بێدارو ئاتاجەکانەو هەروەك پێغەمبەر (دخ)لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت :(( الدعاء مخ العبادة )) واتە: نزا و پاڕانەوە لە خودای گەورە مۆخ و کرۆکی عیبادەتە و مرۆڤ لە رێی ئەوەوە دەگاتە قوڵایی بەندایەتی و خۆشەویستی خۆی بۆ پەروەردگارە بەخشندە و میهرەبانەکەی. ( مۆخ) وەك لە فەرمودەکەدا هاتووە

پێش هەموو شتێك بەو شانانە دەوترێت كە لە بۆشایی ناو ئێسقانەكاندا هەیە، لێرەشەوە دەبێت ئێسكەكانی عیبادەت و خواپەرستی بناسین بۆ ئەوەی بزانین بۆچی نزا و پاڕانەوە ڕۆڵی ( مۆخ ) و كرۆك دەبینێت ؟ ... پێشەوای گەورە مامۆستا سەعید نورسی كوردی وەڵامی ئەم پرسیارەمان بۆ دەداتەوە و دەڵێت :((ئەم فەرموده فەرموده لە فەرموده بنەڕەتی (أصول) هكانە وە فێرمان دەكات كە جەوهەرو كرۆكی ئیسلام لە سێ بەش و پلە پێك هاتووە كە ئەوانیش بریتین لە **ئیسلام** بەواتای (خۆ بەدەستەوە دان) ، ئەم خۆ بەدەستەوە دانش بە خودای گەورە لە پێنج پایەی ئیسلامدا واتە ( شایەتمان و نوێژ و ڕۆژو و حەج و زەكات داندا دەردەكەوێت ) وە باوەڕ ( كە ئەویش دەست گرتنە بە (شەش) پایەی جەوهەری و سەرەكی كە بریتین لە ( باوەڕهێنان بە خودای گەورە و فریشتەكان و كتێبە ئاسمانیەكان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و زیندوبوونەوە و قەزا و قەدەر ) لەگەڵ چاكە (**الاحسان**) ( كە بریتییە لە فەزیلەت و بەرزی و بڵندی یاخود كردنو ئەنجامدانی هەموو كارو كردەوەیەكی جوانو شیرین، جا پێویستە ئەم فەرمودە هەژموونی( هیمنة) بەسەر هەموو كار و ڕەوت و ئاستەكاندا هەبێت).

جا ئەگەر نزاو پاڕانەوە ( مۆخ) ی عیبادەت بن ئەوا ( **ئیسلام** ) و ( **ئیمان** ) و ( **ئیحسان** ) بەسەر یەكەوە لە واقیعدا ئێسكەكان پێك دەهێنن، چونكە خودا پەرستی و خۆ دان بەدەستی خودای گەورە چ واتایەكی هەیە ؟ وە ئەم پەرستن و عیبادەتە چ واتایەكی هەیە كە بێ باوەڕ بوون بەوەی كە خودای گەورە چاودێری كار و كردەوەكانی ناخ و دڵ و دەرونی دەكات ؟ وە واتای ئەم خواپەرستییە چییە كە ڕاز و نیازە لەگەڵ یەكێك كە پاك و بەرز و بڵندە؟ ئایە ئەمە كردنی هەموو كارێكی جوان و شیرین نیە كاتێك موسوڵمان بیردەكاتەوە و دەزانێت دەبێت كارەكانی بەناوی خوداوە دەست پێ بكات.

## ئەو شتانەی مرۆڤ بۆیان لە خودا دەپاڕێتەوە

دەتوانین بڵێین بێجگە لەو هەموو بەرهەم و جێگە ووتە جوانانەی كە لە نزا و باوەڕدا هەن، بە شێوەیەكی گشتی پاڕانەوەكانی مرۆڤ بۆ نزا و پاڕانەوە ئەم سێ شتەن :

یەكەم –

بۆ داواكردنی لێ خۆشبوون لە بەردەم خودای گەورە لە بەرامبەر تاوانەكانی، كەسی گوناهكار لە خودای گەورە دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی پەروەردگار لێی خۆش بێت و لاپەڕەیەكی نوێ لەگەڵیدا هەڵداتەوە و بە چاوی سۆز و بەزەییەوە بۆی بڕوانێت.

دیارە مرۆڤ بە حوكمی مرۆڤ بوونی ئەگەری تووش بوون بە گوناه و بێ ئاگایی هەیە:((كل ابن آدم خطاء و خير الخطائين التوابون)) واتە: هەموو مرۆڤێك هەڵە دەكاتو باشترین مرۆڤە هەڵەكەرەكانیش ئەوانەن كە تەوبە دەكەنو دەگەڕێنەوە بۆلای خودای گەورە و پەشیمانی دەردەبڕنو هەوڵدەدەن نەچنەوە سەر گوناه و تاوان، ئێمە كاتێك بە هۆیەك لە هۆیەكان دووچاری گوناه و سەرپێچی دەبین نابێت لە سۆز و بەزەییو لێخۆشبوونی خودا نائومێد بین، بەڵكو هەروەك خودای گەورە خۆی ڕێنوێنی كردوین دەبێت بە دڵ داوا لە خودای گەورە بكەین بۆ ئەوەی لێمان خۆش بێتو

هەوڵبدەین بە چاکەکردنی زیاتر قەرەبووی ئەو هەڵەیە بکەینەوە، خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:(( قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)) (الزمر٥٣) واتە: ئەی (محمد) بەو بەندانەم بڵێ کە زیادەڕەوییان لە خراپەو تاواندا کردووە لە بەزەیی خودا نائومێد نەبن و وا نەزانن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای خوداو ژیانی خۆیان بگۆڕن خودا لێیان خۆش نابێت، چونکە دەبێت بزانن بە راستی ئەگەر ئەوان لە دڵەوە بڕیاری گەڕانەوە بۆ لای خودای خۆیان بدەن ئەوا ئەو لە سەرجەم گوناهەکانیان دەبورێت، چونکە ئەو لە راستیدا یەکجار لێبوردە و میهرەبانە.

لە قورئانیشدا خودای گەورە رێنوێنیمان دەکات داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانی لێ بکەین هەروەك دەفەرموێت:((... رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ)) (آل عمران١٩٣).

واتە: ئەی پەروەردگار لە گوناهەکانمان خۆشبەو پەردە بەسەر تاوانەکانماندا بدەو لەگەڵ چاکەکارانی خوداویستدا بمانمرێنەو بمانگێڕەوە بۆلای خۆت.

پێداویستی مرۆڤ کە لە رێی نزاو پاڕانەوەوە دەری دەبڕێت کە بریتییە لە ئومێدو نیازو پێویستی بە رێنوێنی و دەست گیرۆیی و چاودێری خودایی هەیە.

دووەم –

مرۆڤ بە حوکمی ئەوەی لەم ژیانەدا لە ناو کۆمەڵگەیەدا دەژی و هەواو ئارەزوی خراپی هەیەو فشاری دەوروبەرو کۆمەڵگەش لە ئارادایەو، پێویستی بە هۆشیاری و بێداری تەواو هەیەو، دەبێت داوا لە خودای گەورە بکات بۆ ساتێکیش چاوی لێ کەلا نەکات و لە چاودێری و رێنوێنی خۆی بێ بەشی نەکات. پێغەمبەر(دخ) لە فەرمودەیەکدا فێری نزای کردوین کە دەفەرموێت:(( اللهم لا تكلني إلى نفسي طرفة عين )) . واتە: ئەی پەروەردگارم بۆ چاو تروکانێك مەمدەرە دەست نەفسی خۆم و لە بەزەیی و چاودێری خۆت بێ بەشم مەکە.

ئێمەش لە شەوو رۆژدا دەیان جار لە نوێژەکانماندا داوا لە خودای گەورە دەکەین:(( اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ)) (الفاتحة٦) خودایە گیان رێنوێنیمان بکە بۆ رێگەی راست و امان لێ بکە لە کات و شوێنە جۆراجۆرەکاندا بڕیاری راست بدەین و رەفتارو هەڵوێستی راست بنوێنین و کارێك نەکەین لەگەڵ ناسنامەی باوەڕدارانەمان و رازی بوونی تۆ نەگونجێت. ((... رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا))(الكهف ١٠). واتە: ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە سۆز و بەزەیمان پێ ببەخشە و بۆ سەر دابارێنە ، وە لە کاروبارەکانی ژیاندا سەرفرازمان بکە و وامان لێ بکە کە بەو جۆرە بڕیار بدەین و هەنگاو هەڵگرین کە عەقڵێکی پێشکەوتوو دەیخوازێت و رزگاری و سەربەرزی هەردوو دونیاشی بۆمان تێدایە .. ئامین. (( رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ)) (آل عمران ٨) واتە: ئەی پەروەردگارمان دڵمان گومڕا مەکە دوای ئەوەی رێگای راست و خواپەرستیت

نیشان داوین  وە لە لای خۆتەوە بەزەیمان پێ ببەخشە  بە راستی بەخشینی تۆ سنوری بۆ نیە و یەکجار بەخشندەی.

بە شێوەیەکی گشتی داواکردنی لوتفو سامانو سەرکەوتنو بەخششو خۆشەویستیو  لەش ساغی و زانست و هەرچی جێی ئاواتی مرۆڤە و دەیەوێت دەستی بکەوێت لە رزق و رۆزییە ماددیو مەعنەویەکان.

مرۆڤ جگە لەو شتانەی لە خاڵی یەکەم و دووەمدا  باسکرا دەتوانێت ئاتاجی و پێداویستی ماددی و رۆحیەکانی خۆی لە رێی نزاو پاڕانەوەوە لە خودای گەورە داوا بکات،  لە قورئانیشدا نمونەی چەندین نزای لەم جۆرەمان هەیە لە وێنەی: ((... رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)) (البقرة٢٠١) واتە: ئەی پەروەردگارمان لە دونیاو رۆژی دواییدا چاکەمان بێنە رێو لە سزای ئاگر بەدورمان بکە. ((... وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا)) (طه ١١٤). واتە: خودایە زانیاریم زیاد بکە.

## مەرجەکانی نزا و پاڕانەوە

نزا و پاڕانەوە بۆ ئەوەی جێگەی قبوڵی بارەگای پەروەردگار بێت دوای ئەوەی بە ناوی خودای گەورە دەست پێ دەکرێت  دروود و سڵاو بۆ گیانی پێغەمبەری مەزن(دخ) رەوانە دەکرێت نزاکار دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

١ – نزاکە دەبێت تەنها بە زمان نەکرێت بەڵکو لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵێت و لەگەڵ دەستەکانو زمانمان رووی دڵمان بکەینە پەروەردگار.

٢ – باوەڕ بوون بەوەی کە خودای گەورە نزا و پاڕانەوەکەت لیٚ وەردەگرێتو نائومێدت ناکات،  لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە:(( أنا عِنْدَ ظَنِ عَبْدِي بِي )) (بوخاری ریوایە تی کردووە) واتە: بەندەکەم نیازی  بە من چۆن بێت منیش بەو جۆرە دەبم لە گەڵیدا، با ئێمەش نیازی باشمان بە خودا هەبێت، هەروەها پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی:((ادعوا الله وانتم موقنون بالإجابة)) متفق علیە .. حدیث : ١٧٥٦ واتە : ئێوە کە لە خودا پاڕانەوە گومانتان لەو نەبێت کە خودا وەریدەگرێت.

٣ – شتی داواکراو شتێك نەبێت پێچەوانەی ئەو یاسایانە بن کە بوونەوەر بەڕێوە دەبەن، چونکە نزا کۆمەکییە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵە ئامانجێك، نزا کردن جێگەی هەوڵ و تێکۆشان و کردەوە ناگرێتەوە.

٤ – هەوڵدان بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ ناوەڕۆکی نزا و پاڕانەوەکاندا، هەوڵدەیت دڵت پاك کەیتەوە خۆت لە خواردنی حەرام و رەفتاری ناشیرین  بە دور بخەیتەوە، هەروەهامافی خەڵکی نەخۆین.

٥ – هەندێك لەو شتانەی داوای دەکەیت لە خۆتدا رەنگ بداتەوە، بۆ نمونە تۆ داوا لە خودای گەورە دەکەیت لێت ببورێت و لێت خۆش بێت، دەبێت خۆشت بەرامبەر ئەو کەسانەی هەڵەیان بەرامبەرت کردووە لیٚ بوردە بیت ، دەنا چۆن داوای شتێك لە خودا دەکەیت کە خۆت بە کردەوە تێتدا نیە.

٦ – نزای خراپ نەکردن دژ بە موسوڵمانانو داوا نەکردن بۆ ئەوەی خودای گەورە نعمەتێکی پێ بەخشیون لێیان بسەنێتەوە.

٧ – خۆ دور گرتن لە هەندێك گوناه لەوانەش دەنگ لێ وەرگرتن و قسە نەکردن لە گەڵ موسوڵماناندا، ئازار دانی دڵی دایك و باوك، بوونی کینە لە ناو دڵ و دەروندا، چونکە هەموو ئەوانە دەقیان لەسەرە کە رێ دەگرن لەوەی نزا گیرا بێت.

٨ – نزا کردن لە حاڵەتێکدا مرۆڤ لە نێوان ئومێد بە خوداو ترس لەودا بێت، خودای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئاندا باسی ئەم دۆخەی مرۆڤی خوداناسو نزاکار دەکات هەروەك دەفەرموێت: ((... وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ)) (الاعراف ٥٦) واتە: داوای لێ بکەنو هاواری بکەنێ بە جۆرێك کە ترس لە پەروەردگارو ئومێد بە ئەو تێکەڵ بووبێت، بە راستی رەحمەتی خودا لە چاکە کارانەوە نزیکە. یاخود دەفەرموێت:((... يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا ...)) (السجدة ١٦).

## ئەو کات و حاڵەتانەی زۆرتر نزایان تێدا گیرا دەبێت

هەڵبەت وەك باسکرا نزا کردن و پاڕانەوە لە خودا کات و ساتێکی دیاریکراوی نیە، بەڵام سەرەڕای ئەوە وەك لە هەندێك فەرمودە و لێکدانەوەی زانایاندا ئاماژەی پێ کراوە لە هەندێك حاڵەتو کات و شوێندا نزا زووتر گیرا دەبێت لەوانەش:

١ – نزاکردن لە دوای نوێژە فەرزەکان.

٢ – نزاکردن لە تاریکایی شە و بەرەبەیاندا.

٣ – نزاکردن لە رۆژی هەینی دا.

٤ – نزاکردنی مرۆڤی ستەم لێکراو.

٥ – نزاکردنی دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان.

٦ – نزاکردنی باوەڕدار بۆ خوشك و برا موسوڵمانەکانی دیکە بێ ئەوەی خۆیان ئاگایان لێی بێت کە نیشانەی دڵپاکی و دلسۆزییە بەرامبەریان.

٧ – نزاکردن لە پاڵ کەعبەدا.

٨ – نزاکردن لە کاتی ناڕەحەتی و لێقەوماندا بە تایبەتیش ئەو حاڵەتانەی مرۆڤ دەستی لە هەموو شتێك دەپچڕێت و تەنها خودا دەمێنێت بە هانایەوە بچێت.

**پرسیار :**

١- بۆچی دەبێت نزا بکەین و لە خودا بپاڕێینەوە ؟

٢- نزاکردن چ کاریگەریەك بەسەر دەرون و ژیانی مرۆڤی باوەڕدارەوە بەجێ دەهێڵێت ؟

٣- گیرابوونی نزا لەلایەن خودای گەورەوە چ پەیوەندیەکی بە رەفتار و ژیانی رۆژانەی مرۆڤەوە هەیە ؟

**گفتوگۆ :**

بایەخدانی گەورەی زانستی پەرەپێدانی مرۆیی و دەرونزانی بە نزا و پاڕانەوە وەك هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەرونیەکانو هەست کردنی مرۆڤ بە ئارامی دەرونی لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە ؟



## وانەی شەشەم

## پێگەی ڕەوشتی جوان لە ئیسلامدا

ئیسلام ئاینی سروشتی (فطرة) ی پاكو تەندروستو ژێرە پێگەیشتوەكانو دەرونە خاوێنەكانە، ئەگەر ڕەوشتیش لە سەرجەم ئاینە ئاسمانیەكاندا پێگەیەكی خولگەییو بەهێزی هەبووبێت، ئەوا لە ئیسلامیشدا بە هەمان شێوەو بەهێزتریشە، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین دوای باوەڕ ئیسلام بە پلەی یەكەم پەیامێكی ڕەوشتییە .

ئیسلام هەر لە یەكەم ساتی هاتنە خوارەوە و سەرهەڵدانیدا، هاوشان لەگەڵ دژایەتی كردنی بیروباوەڕو بۆچوونی نەفامانەی ئەو سەردەمە، دژایەتی ئاشكرای خۆشی بۆ هەموو ئەو ڕەوشت و ڕەفتارانە ڕاگەیاند كە هەڵقوڵاوی ئەو بیروباوەڕە نەفامیە بوون و لەگەڵ ئەو ڕێز و ڕۆڵە نەدەگونجان كە خودای گەورە بە مرۆڤی بەخشیووەو دەخوازێت بەو شێوەیە بژیت .

ئیسلام بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدات كە هەستی ڕەوشتی لای تاكی موسوڵمان پەرە پێ بدات و وای لێ بكات ژیانێكی پڕ ڕەوشتی جوان بباتە سەر، چونكە جوانی و كەسێتی مرۆڤ بە ڕەوشتی بەرزەوەیە و، هەر ئەویش وای لێ دەكات لای خودا و خەڵك و كۆمەڵگە خۆشەویست بێت .

هەروەها ڕەوشتە جوانەكان هۆكارێكی گرنگی پێشكەوتنو ئارامی و ئاسایشی كۆمەڵایەتین . ڕەوشت خراپیش هۆكارێكی هەڵوەشاندنەوە و ئاژاوە و نائارامی كۆمەڵگەكانە.

ئیسلام هانی مرۆڤ و خەڵكی دەدات بۆ پەیڕەو كردنی ڕەوشتە جوانەكان وە دەیكات بە پێوەری دوور و نزیكی لە پێغەمبەرەكەی (دخ) لە ڕۆژی دواییدا . هەروەك لەم بارەیەوە پێغەمبەر (دخ) لە فەرمودەیەكدا دەفەرموێت:(( إنَّ أقربكم منّي منزلاً يوم القيامة أحاسنكم أخلاقاً الموطأون أكتافاً الذين يألفون ويؤلفون، وأبغضكم إليَّ وأبعدكم منّي منزلاً يوم القيامة الثرثارون المتشدقون المتفيقهون ))، واتە: خۆشەویست ترین و نزیكترین كەستان لە منەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن كە لە ژیانی دونیادا خاوەنی ڕەوشتی جوان بوون.

لە بەرامبەرەوە پێغەمبەر(دخ) باس لەوە دەكات كە ڕق لێبووە ترین كەستان بۆ منو دورترینتان لێم لە ڕۆژی دواییدا زۆربلێو قسە زلو خۆ بە زل زانەكانتانە، ئەوانەی كە گوێ نادەن بە ڕەفتاری خۆیانو وا دەزانن تەنها بە هەندێك قسەی لوس و بریسكە دار هەستی ڕەوشتی خەڵك تێردەكەن، لە كاتێكدا ڕەوشت ڕەفتارو كردەوەیە، خراپ بەكارهێنانی زمانیش جۆرێكە لە ڕەفتار ناشیرینیو ڕەوشت نزمی.

ئیسلام لە قورئانەكەی خۆیدا بانگەشە بۆ ڕەوشتە بەرزەكان دەكاتو هانی باوەڕدارانو سەرجەم خەڵكی دەدا بۆ دەست گرتن بە چاكەكانو دوركەوتنەوە لە هەموو خراپەو ڕەوشتە ناشیرینو كردارە قێزەونەكان:(( إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)) (النَّحل٩٠) واتە: خودا فەرمان بە دادپەروەریو چاكەكاری دەكات وە

قەدەغەی تاوان‌وخراپەو رەفتارە دزێوەکان‌و زوڵم‌و ناڕەوایی دەکات‌و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی بە بیرتان بێتەوە و توشی بێ ئاگایی نەبن‌و ئەرکەکانی سەرشانتان بیر نەچێتەوە.

بەڵکو لە ڕێی وردبوونەوە لە هەندێك فەرمودەی پێغەمبەر(دخ) ئەوە دەخوێنینەوەو هەڵدەهێنجین کە رەوشت باشی لای خودا لە سەرگەرم بوون بە خوداپەرستییەوە بە ڕێزترو باشترە کە وا لە خاوەنەکەی ناکات بایەخ بە رەوشتی جوان بدات:(( ان العبد ليبلغ بحسن خلقه عظيم درجات الآخرة و شرف المنازل و أنه لضعيف العبادة ، و إنه ليبلغ بسوء خلقه أسفل درجة في جهنم )) (ئەبوداود ریوایەتی کردووە).

واتە: مرۆڤ ئەگەر خواپەرستیشی زۆر نەبێت (لە دوای ئەنجامدانی فەرزەکان) ئەوا دەتوانێت لە ڕێی ژیان بە گوێرەی رەوشتە بەرزەکان بگات بە پلە و پایە و مەنزڵگایەکی مەزن و شکۆمەندی رۆژی دوایی، لە کاتێکدا بە هۆی رەوشت خراپییەوە دەشێت بچێتە تونی دۆزەخەوە، ئەمەش لە ئیسلامدا شتێکی سروشتییە، چونکە یەکێك لە بەرهەمە شیرینەکانی عیبادەت و بەڵگە لەسەر باش ئەنجامدانیان و تێکەڵاو بونیان بە دڵ و دەرونی مرۆڤەوە باش ژیان و رەوشتی جوانی ئەو باوەڕدارانەیە کە ئەو خوداپەرستییە ئەنجام دەدەن بۆ نمونە خودای گەورە دەربارەی کاریگەری نوێژ لەسەر ئاراستەی رەوشتی مرۆڤی باوەڕدار دەفەرموێت:((...إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ..)) (العنكبوت٤٥) واتە: لە راستیدا نوێژ خاوەنەکەی لە هەرچی کردەوەی خراپ و دزێو و نەشیاوە دەگێڕێتەوە ، لەو سۆنگەشەوە کە رەوشت جوانی لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا بەرجەستە دەبێت ، ئەوا رای خەڵك لە بارەی کەسێکەوە، حوکمدانە بەسەر رەوشتی ئەو کەسەدا، لە هەندێك فەرمودەی پێغەمبەریشدا هاتووە کە رای گشتی خەڵك و حوکمدانیان بەسەر کەسێکدا لە روی رەوشتییەوە شوێن و پلە و پایەی ئاینی کەسەکە لای خودای گەورە دەست نیشان دەکات.

لەم بارەیەوە لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە:(( ان النبي (ﷺ) كان ذات يوم جالساً مع أصحابه ، فمرت جنازة أثنى الحاضرون على صاحبها خيراً فقال النبي(ﷺ): وجبت، و سكت ثم مرت جنازة أخرى فقال الحاضرون عن صاحبها شراً فقال النبي (ﷺ):وجبت ، فسأله أصحابه عن معنى قوله وجبت في الحالتين المختلفتين، فقال:(( أمّا الأول فأثنيتم عليه خيراً فوجبت له الجنة، وأمّا الثاني فقلتم عنه شراً فوجبت له النار)) ترمزی ریوایە تیکردووە.

واتە: رۆژێك لە رۆژان پێغەمبەر(دخ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو ، تەرمێك بە لایاندا تێپەڕی و ئامادەبووان ستایشی چاکە و کارە باشەکانیان کرد پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: بۆی بڕایەوە یاخود چەسپا، جا بێ دەنگ بوو،دوای ماوەیەك تەرمێکی دیکە تێپەڕبوو ئەمجارەیان ئامادەبووان بە خراپە باسی خاوەنەکەیان کرد، ئەمجارەشیان دووبارە فەرمووی: وەرگیرا یاخود چەسپا، جا هاوەڵانی پرسیاری جیاوازی مانای بۆی بڕایەوە (وجبت) یان لە هەردوو شوێنەکەدا لێپرسی، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی :هەرچی یەکەمیان بوو ئێوە بەباش ناوتان بردو ستایشتان کرد بەهەشتی بۆ بڕایەوە. بەڵام دووەمیان کە بە خراپە ناوتان هێنا دۆزەخ‌و ئاگری بۆ بڕایەوە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە رازی بوونی خەڵکی لە کەسێك بەڵگەیە لەسەر رەوشت جوانی، ئەمەش لە پاڵ باوەڕدا دەبێتە مایەی خودا لەخۆ رازی کردن و بە پێچەوانەشەوە .

باوەڕدارانیش تێدەگەیەنێت کە چاکەخوازی( البر)پەیوەندی بەهەندێك شتی ڕواڵەتییەوە نیە بەڵکو ناونیشانە بۆ هەموو ئەو کارو کردەوە چاکو جوانانەی لە هەستێکی ڕەوشتی پاكو دڵێکی ڕوناك بە باوەڕ و خۆشەویستی خوداو خەڵکی سەرچاوە دەگرن:((لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ))(البقرة ١٧٧)
واتە: چاکەخوازی ئەوە نیە ڕوو بکەینە ڕۆژهەڵات یاخود ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکە بریتییە لەوەی مرۆڤ باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دواییو کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران بێت، وە لەگەڵ ئەوەی کە ماڵو سامانەکەی خۆش دەوێت بەشی خزمانی هەژار و بێ باوکانو ڕێبوارانو داواخوازان (السَّآئِلِينَ)و ئەو بەندانەی لێ بدات کە دەیانەوێت لە بەرامبەر پێدانی بڕێ پارە ئازادی خۆیان بکڕنەوە، هەروەها نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و پەیمان بەجێ دەگەیێنن کاتێك کە پەیمان دەدەن، ئەوانەی لە کاتی سەغڵەتیو برسێتیو ڕووبەڕووبوونەوە لە جەنگدا ئارام دەگرن بەراستی ئەوانە ڕاستگۆ و لەخودا ترسن.

**پرسیار :**

١ – بۆچی پێگەی ڕەوشت لە ئیسلامدا بەهێزە و لە تەرازوی چاکەی مرۆڤی باوەڕداردا لە ڕۆژی دواییدا قورسە ؟

٢ – لاوازی ڕەوشت لەگەڵ بوونی خواپەرستی ڕواڵەتیدا چی دەگەیەنێت ؟

**گفتوگۆ :**

هاتنی پێغەمبەر (دخ) بۆ تەواوکردنی ڕەوشتە جوانەکان چی دەگەیەنێت.

## وانەی حەوتەم

# پێغەمبەر (دخ) سەرمەشقی مەزنی ڕەوشـــتی بەرز و چـــاکـــەخـــوازی

پێغەمبەر (دخ) مەزنترین سەرمەشقی ڕەوشتی باوەڕداران‌و بەڵکو سەرجەم ڕەوشت دۆستانە. قورئان دەربارەی پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت:(( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ))(الاحزاب٢١). واتە: ئێوە لەپێغەمبەر دا (دخ) سەرمەشقێکی باش‌و پێشەنگتان هەیە چاکەخوازە بۆ هەموو ئەوانەی ئومێدیان بە خودا و ڕۆژی دوایی بەستووە و یادی خودا زۆر دەکەن.

کەواتە بە گوێرەی دەقی قورئان و جێکەوتی ژیاننامەی پێغەمبەر(دخ) خۆشی (..پێغەمبەری مەزن سەرمەشقێکی ڕەوشتی مەزنی باوەڕداران و بەڵکو تەواوی مرۆڤایەتییە).

ژیانی ڕۆژانەی پێغەمبەر(دخ) و مامەڵە و هەڵس و کەوتی لە ناو خێزان و کۆمەڵگەو لەگەڵ هاوەڵ‌و دوژمنەکانیدا بە گشتی، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە لە هەموو کاتێکدا بە گوێرەی بنەماکانی ڕەوشتە بەرزەکان جوڵاوەتەوەو مامەڵەی کردووە، بە کردەوە ناوەڕۆکی ئیسلامی لە ڕێی ژیانی خۆیەوە بەرجەستە کردووە و نیشانداوە، بە جۆرێك کە دەتوانین بڵێین وەکو قورئانێکی زیندو وابووە لە ناو خەڵکیدا.

هەر بۆیەشە کاتێك دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر (دخ) لە خاتوو عائیشەی هاوسەریان پرسی، لە وەڵامدا وتی:(( كان خلقه القرآن)) واتە: ڕەوشتی ئەو قورئان بوو، واتە بەرجەستە کردنی ناوەڕۆکی قورئان بوو . ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر (د.خ) بەڵگەیەکی بەهێزی ڕاستی پێغەمبەرایەتی ئەوە، خودای گەورەش لە قورئاندا شایەتی ئەم ڕەوشتە مەزنەی بۆ دەدات‌و سەبارەت بەو دەفەرموێت:((وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ))(القلم٤). واتە: ئەی (محمد) بە ڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی یەکجار مەزنی.

لەم ئایەتەو هەندێك لە ئایەتەکانی دوای ئەمیشدا بە جوانی تێدەگەین کە ململانێی پێغەمبەر(دخ) لەگەڵ نەیارە هاوبەشی پەیداکەر و بێ باوەڕەکانی سەردەمی خۆیدا ململانێ بووە لە نێوان دووجۆر لە ڕەوشت، ڕەوشتی باوەڕو پێغەمبەرایەتی، لەگەڵ ڕەوشتی بێ باوەڕی و هاوبەشی پەیداکردن و نەفامی دا. هەروەها ڕون دەبێتەوە کە جەنگی پێغەمبەر (دخ) لە ڕوبەرێکی گەورەیدا جەنگ و جیهادێکی ئەخلاقی بووە.

لەم سۆنگەشەوە پێغەمبەر (دخ) پەیام و ئەرکی پێغەمبەرایەتی خۆی بەوە پێناسە دەکردو لێکدایەوە کە هاتووە ڕەوشتە بەرزەکان بەرەو تەواوی بەرێت:(( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق )) لێرەشدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە **(مكارم الأخلاق)** تەنها باسی هەندی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی ئاسایی ناکات بەڵکو لە ناوەڕۆکدا ئاماژەیە بە هەموو ئەو بەهاو بنەمایانەی کە کەرامەتی مرۆڤ دەپارێزن.

هەر لەبەر ئەوەش خودای مەزن خۆی پێغەمبەری پێگەیاندبوو لە ژێر چاودێری خۆیدا بووبووە نمونەی کەسێتیەکی مەزنو سەرمەشقێکی گەورە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە گشتی و بە تایبەتیش بۆ شوێنکەوتووان و خۆشەویستانی.

هەر لە چوار چێوەی ڕێنوێنیەکانی خودای گەورە بۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر (دخ) بۆ ئەو ئەرکو سەرمەشقییە، لە قورئاندا ڕوبەڕووی دەفەرموێت:(( خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ)) (الاعراف١٩٩) واتە: چاو لە هەڵە و کەم و کوڕیەکانی خەڵکی بپۆشە(بۆ نمونە سەر لەو خزمو دۆستانە بدە کە سەردانت ناکەن، لەوانە ببورە ستەمت لێ دەکەن، دیارە لە مەسەلە کەسایەتێکانداو لە شوێنێکدا تۆ دەتوانیت لێیان خۆش نەبیتو دەستەڵاتی ئەوەت هەیە مافی خۆتیان لێ بسەنیتەوە). فەرمان بە چاکە بکە و ڕوو لە کەسانی نەفام وەربگێڕە و بایەخیان پێ مەدە، بێنە و بەرەیان لەگەڵ مەکە و مەچۆرە ئاستی ئەوانەوە، یەکێك لە ڕەوشتە هەرە بەرزەکانی پێغەمبەریش(دخ) لێبووردەیی بووە، کە یەکێکە لە مەزنترین فەزیلەتە ڕەوشتییەکان.

بەم جۆرە ئێمە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانماندا دەتوانین بە شوێنکەوتنی ئەم سەرمەشقو رابەرە ڕەوشتییە گەورە خۆمان بە چاکەخوازی برازێنینەوە و ژیانێکی ئارام و بەختەوەر بەسەر بەرین، لێرەشەوە خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ) و ناسینی کەسایەتی ئەو بە درێژایی تەمەنیو بە تایبەتیش سەردەمی پێغەمبەرایەتییەکەی دەبێتە، ئەرکی سەرشانی هەموو باوەڕدارو شوێنکەوتوویەکی، چونکە ئێمە تا باشتر و قوڵتر لە ژیاننامەکەی شارەزا بینو ڕەفتار و ئاکاری بەرزی بناسین، کاریگەری بۆ سەرمان زۆرتر دەبێت و دەتوانین باشتر سود لە سەرمەشقیو نمونەیی ئەو وەربگرینو لە ڕووی ڕەوشتییەوە بەرەو بەرزیو پێگەیشتوویی زیاتر بچین، ئەویش تەنها ڕەنگدانەوەیەکی ئەم ئایەتە قورئانیەیە کە لە وەسفی پێغەمبەردا (دخ) دەفەرموێت:((وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ))(الانبیاء ١٠٧)، واتە: ئێمە تۆمان بۆ ئەوە ڕەوانە کردووە ببیتە سەرچاوەی سۆزو بەزەیی بۆ جیهانیان.

ئەو تەنها لەگەڵ شوێنکەوتووانی خۆیدا سینە فراوانو لێبوردە نەبووە، بەڵکو لەگەڵ شوێنکەوتەی ئاینەکانی دیکەو بە گشتی هەموو مرۆڤەکاندا بە هەمان ڕۆحەوە مامەڵەی کردووە، هەر لەم پێناوەشدا جەختی لەسەر ڕەوشتی یەکسانی دەکردەوە زۆر هەوڵی دەدا مرۆڤەکان لەوە تێبگەیەنێت کە هەموویان نەوەی یەك دایك و باوکنو لەیەك بنەڕەتەوە هاتوون، بۆیە دەبێت لەگەڵ یەکدیدا بە گیانی برایەتی و لێبوردەییەوە بجوڵێنەوە.

بۆیە دەبینین لە وتاری حەجیماڵئاوایی دا ڕوو دەکاتە هاوەڵەکانی و دەفەرموێت:((أيها الناس من كنت أخذت له مالاً فهذا مالي فليأخذ منه، ومن كنت ضربت له ظهراً فهذا ظهري فليضربه، أيها الناس كلكم لآدم و آدم من تراب لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأعجمي على عربي الاّ بالتقوى)) .واتە: ئەی خەڵکینە ماڵو سامانم لە هەر کەسێك ستاندبێت ئەوە ماڵەکەم و با بێت مافی خۆی وەربگرێتەوە، وە قامچیەکم لە پشتی

هەرکەسێك دابێت ئەوە پشتم با لێی بداتەوە، ئەی خەڵکینە هەمووتان لەئادەمن‌و ئادەمیش لە خۆڵە، نە عەرەب ڕێزی هەیە بەسەر غەیری عەرەبدا  نە غەیری عەرەبیش ڕێزی بەسەر عەرەبدا هەیە، تەنها بە لەخودا ترسان‌و کردەوەی چاکە نەبێت.

**پرسیار:**

**بۆچی خودای گەورە بە پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت تۆ لەسەر ڕەوشتێکی بەرزی ؟**

**گفتوگۆ:**

**پێشەنگی پێغەمبەر (دخ) لە رووی ڕەوشتییەوە بۆ موسوڵمانان چی دەگەیەنێت.**



## وانەی چواردەم

### هەندێك لە خەسڵەتەكانی ڕەوشت لە ئیسلامدا

ڕەوشت لە ئیسلامدا چەند تایبەتمەندی و خەسڵەتێكی تایبەت بە خۆی هەیە لەوانەش :

**پەیوەندی ڕەوشت بە بیروباوەڕەوە :**

خودای گەورە بەڵێنی داوە كە هەر كەسێك پابەندی ئاكار و ڕەوشتە جوانەكان بێت و كردەوەی باش ئەنجام بدات بە بەهەشت پاداشتی بداتەوە، خودای گەورە دەفەرموێت:((مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)) (النحل٩٧) واتە: هەركەسێك لە هەردوو ڕەگەزەكە چاكەكار بێت لە پاداشتی ئەوەدا لە ژیانێكی خۆشدا دەیژیەنین ولە قیامەتیشدا بە گوێرەی باشترین كردەوەی پاداشتی دەدەینەوە .ئەمەش لە بەیەكەوە گرێدانی ئاین و ڕەوشت جوانی لە قورئان و فەرمودەكانی پێغەمبەردا بە جوانی دەردەكەوێت، چەندەها ئایەت لە قورئاندا ئاماژە بە پەیوەندی توندو تۆڵی نێوان باوەڕ و كردەوەی چاكوڕەوشت دەكەن، وە دەیخەینە ڕوو كە باوەڕ و بیروباوەڕ مرۆڤ لە خراپە و ڕەوشتی نزم دەپارێزن بۆ نمونە دەبینین لە قورئاندا لە كاتێكدا داوا لە باوەڕداران دەكرێت دەست بە یەكێك لە ڕەوشتو ئاكارە جوانەكانەوە بگرن لە پێشەو بیری ئەوەیان دەهێنێتەوە كە ئەوان باوەڕدارنو ئەمەش ئەو هەڵوێستە ڕەوشتییەیان لێ دەخوازێت، بۆیە ئەگەر باوەڕ درەختێك بێت یەكێك لە بەرە شیرینەكانی چاكەخوازیو ڕەوشت بەرزییە.

گەر سەیری سەرەتای سورەتی ( المؤمنون) یش بكەین دەبینین باسی كۆمەڵێك كاری چاكو ڕەوشتی بەرز دەكات كە بەرهەمی باوەڕنو باوەڕدارانی ڕاستەقینەیان پێ دەناسرێتەوە:(( قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ①الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ②وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ③وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ④وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ⑤إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ⑥فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ⑦وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ⑧وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ⑨أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ⑩الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ⑪)) (المؤمنون١-١١).

واتە: بەڕاستی باوەڕداران سەرفراز بوون ئەو باوەڕدارانەی ئەم سیفەتانەی خوارەوەیان تێدا بێت:

أ – ئەوانەی كە بە ملكەچی نوێژەكانیان دەكەن.

ب – ئەوانەی گوێ بە قسەی هیچوپوچو نزم و بێ ئامانج نادەنوپشتی لێ هەڵدەكەن.

ج – ئەوانەی زەكات دەدەن.

د– ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن و داوێن پاكن و پەیوەندی جنسیان تەنها لەگەڵ هاوسەری شەرعی خۆیاندایە، چونكە ئەو كەسانەی لەوە تێپەڕن و چاویان لە شتی دیكە بێت لەو مرۆڤانە دەژمێردرێن كە سنورەكانی خودایان شكاندوەو دەستدرێژیان كردووە.

هـ - هەروەها ئەوانەی دەستپاکن‌و ئەو پەیمان و بەڵێنانەی بە کەسانی دیکەی دەدەن بەجێیان دەگەیەنن.

و - وە ئەوانەی پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن و پچڕپچڕ نایانکەن و ناهێڵن نوێژیان بچێت‌و بە جوانیش ئەنجامیان دەدەن.

ز - ئەو باوەڕدارانەی ئەم خەسڵەتانەیان تێدا بێت خودای گەورە بەڵێنی پێداون کە دەبنە میراتگری (فیردەوس) کە بەرزترین و خۆشترین شوێنی بەهەشتە و بۆ هەتاهەتایی‌و بە نەمری تیایدا دەمێننەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ)) (الحجرات٦).واتە : ئەی باوەڕداران، ئەگەر خراپەکارێك هەواڵێکی بۆ هێنان یەکسەر باوەڕ مەکەن و لێی وەرمەگرن بەڵکو هەوڵدەن لە راستی و ناڕاستی هەواڵەکە بکۆڵنەوە بۆ ئەوەی بە هەڵەدا نەچن‌و بڕیاری نادروست نەدەن.

هەر بۆیە هۆکارێکی گرنگی لاوازی رەوشت لە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانیدا لاوازی باوەڕ و کەم بوونەوەی کاریگەری ئەوە بەسەر ئاراستە کردنی ژیانی مرۆڤەکاندا .بۆ نمونە پێغەمبەر(دخ) دەفەرموێت:((لا إيمان لمن لا أمانة له ولا دين لمن لا عهد له)) (ئەحمەد ریوایەتی کردووە) .

واتە : ئەوەی ئەمانەت نەپارێزی باوەڕی تەواو نییە، کەسی پەیمان شکێن‌و بی بەڵێنیش ئاینی تەواو نییە ، واتە لەو هەڵوێستەیدا وەك ئایندار دەرناکەوێت، هەروەها پێغەمبەر(دخ) باوەڕدارانی لەگەڵ چەندین سیفەتدا وەسف کردووە:((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذ جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت)) (بوخاری ریوایەتی کردووە). واتە: ئەو کەسەی باوەڕی بە خوداو رۆژی دوایی هەیە با رێز لە دراوسێکەی بگرێت، وە ئەو کەسەی باوەڕی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە با رێز لە میوانەکەی بگرێت، وە ئەو کەسەی باوەڕی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات هەروەها ئەو کەسەی باوەڕی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە ئەگەر قسەی کرد چاکە بڵێت ئەگەر نا با بێدەنگ بێت.

هەر ئەمەشە وای کردووە رەوشت جوانی ببێتە پێوەرێکی سەرەکی و بنەڕەتی باوەڕداری، واتە مرۆڤ لە رەوشت‌و ئاکارو مامەڵەیەوە سەیری بیروباوەڕو ئاستی باوەڕداری‌و راستگۆیی ئاینی دەکرێت، پێغەمبەریش(دخ) لەم روەوە دەفەرموێت:((أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم اخلاقاً)) (ترمزی ریوایەتی کردووە).

واتە: تەواو ترینی باوەڕداران رەوشت جوانترینیانە.چونکە باوەڕداری قسەی بریسکەدارو لاف لێدان‌و ئاوات هەڵخواستن نیە، بەڵکو هەروەکو وتراوە: باوەڕ راستییەکە لە دڵ‌و دەروندا دەچەسپێت‌و رەگ دادەکوتێت‌و بە زمان دەردەبڕدرێت‌و رەزامەندی لەسەر دەدرێت‌و کردەوەو ئاکاری بەرزی باوەڕدارانەش پشت راستی دەکاتەوە و دەیسەلمێنێت.

**پرسیار :**

١ – چۆن لە پەیوەندی ڕەوشت بە بیروباوەڕی موسوڵمانەوە تێ دەگەیت ؟

٢ – دەبێت بیروباوەڕ چ کاریگەریەکی بۆ سەر ڕەوشتی  موسوڵمان هەبێت ؟

**گفتوگۆ :**

بۆچی هەندێك کەس سەرەڕای ئەوەوی باوەڕدارن ڕەوشتیان لە هەندێك ڕووەوە ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕەکەیان نیە ؟



## وانەی نۆیەم

### هۆیەکانی پەروەردەکردنی ڕەوشتی

پەروەردەکردنی ڕەوشتی لە ئیسلامدا هۆی جۆراوجۆری خۆی هەیە کە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانە کار لەسەر پەروەردەی تاك و کۆمەڵ دەکات.

با بزانین واتای پەروەردەی ڕەوشتیو بایەخ و هۆیەکانی چین ؟

### واتای پەروەردەی ڕەوشتی

پەروەردەی ڕەوشتی لە ئیسلامدا بریتییە لە کار کردن لەسەر ڕەوشتە جوانەکانی لە دەرونی باوەڕداران بە گشتی و بە تایبەتیش نەوەی نویٚ .

لە پێناو ڕاست کردنەوەی ڕەفتارو پاککردنەوەی و پاراستنیان لە لادانو هەڵخلیسکانو دورخستنەوەیان لە ڕەوشتە ناشیرینەکانو چاندنی تۆی لە خودا ترسان لە دڵ و دەرونیاندا.

ڕواندنی ڕەوشتە جوانەکانیش لە ڕێی چەند هۆیەکەوە دێتە دی لە وێنەی سەرمەشقی باش، فێرکردنی ڕاستەوخۆ، چاودێری خودی، خوداپەرستیو ئامۆژگاری، ئاراستەکردن، ترساندنو ئومێد خستنەبەر (**الترغيب والترهيب**).

### بایەخی پەروەردەی ڕەوشتی

بایەخی پەروەردەی ڕەوشتی لەوەدایە ڕەوشتە ئیسلامیەکان بە تاکەکان دەناسێنێتو ئامادەیان دەکات بۆ ئەوەی ڕەوشتەکانو ئەوەی فێری بوون لە ژیانیاندا پیادەی بکەنو بە ڕەفتاری ڕۆژانەو هەڵس وکەوتیانەوە دیار بێت.

کەواتە پەروەردەی ڕەوشتی ئیش لەسەر بڵاوکردنەوەی ڕەوشتو فەزیلەت لە ناو کۆمەڵگەو هۆشیارکردنەوەی خەڵك بەرامبەر ڕەوشتە ناشیرینەکان دەکات، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بتوانن هەڵسو کەوتی خۆیان بەجۆرێك بگۆڕن کە لەگەڵ ڕێنوێنیەکانی پەروەردگارو ڕەوشتە بەرزەکان بگونجێنو مرۆڤ لە مامەڵە کردنیدا ڕەچاوی بنەما ڕەوشتییە جوانەکانی وەکو دادپەروەری، چاکەخوازی، چاوپۆشیو لێبوردەییو بەدەمەوەچوونو میهرەبانیو سینەفراوانیو ... هتد، بکات.

### شێوازەکانی پەروەردەی ڕەوشت

باسمان لەوە کرد کە پەروەردەی ڕەوشت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە لە ڕێی چەندین هۆوە ئەنجام دەدرێت: سەرمەشقی چاکە (**القدوة الصالحة**): پەروەردەکردن بە سەرمەشقی چاکە لە کاریگەرترین هۆیەکانی پەروەردەی ڕەوشتییە: بۆیە ئیسلام زۆر بایەخی بەم هۆیە داوە:(( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا)) (الاحزاب٢١).واتە: بۆ هەموو ئەوانەی

ئومێدیان بە خوداو رۆژی دوایی بەستۆتەوەو زۆر یادی خودا دەکەن لە پێغەمبەردا سەرمەشقی چاکەیان هەیە و دەست دەکەوێت.

بۆیە پێویستە ئەوانەی پەروەردەی رەوشتی کەسانی دیکە دەکەن، هەوڵبدەن خۆیان لەو رووەوە نموونەو پێشەنگ بن‌و ئاسەواری ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن بە ژیان‌و رەفتاریانەوە دیار بێت. ئەرکی سەر شانی هەر باوەڕدارێکیشە برا بێت یاخود خوشك‌و باوك‌و مامۆستاو کاربەدەست‌و خاوەن هەر پیشەیەك بێت. جگە لە بوارە گشتییە ئیسلامییەکە وەك موسوڵمانێك لە بوارەکەی خۆشیدا رەمزی پاکی‌و دڵسۆزی‌و پێشەنگی بێت‌و پێش قسەی بە کردەوە هەڵە رەوشتییەکان بۆ دەوروبەری راست بکاتەوە، ئێمە هەر یەکەمان ئەگەر قوتابی بین لەبەردەم یەکێکی دیکەدا و شتیان لێ فێر ببین لە هەمان کاتدا کەسانێك هەن چاویان لەسەر ئێمەیە و شتمان لێوە فێر دەبن.

وەك لاوێکی باوەڕدار و هۆشیار و خاوەن پەیام نابێت رێگە بە خۆمان بدەین خەڵکی شتێك لە ئێمەوە فێر ببێت کە لەگەڵ بنەمای ئیسلام و بەها رەوشتیە جوانەکان نەگونجێت، پێغەمبەر(دخ) دەفەرموێت :((**كلكم راع، وكلكم مسؤول عن رعيته**)) هەریەکەتان لەوکەسانە لێپرسراوە کە شتی لێ وەردەگرن و چاویان لە ئەوە. هەروەها دەفەرموێت:((**من سنَّ سُنَّةً حسنةً، فله أجرها وأجرُ مَنْ عَملَ بها، من غير ان ينقصَ من اجورهم شيءٌ، ومن سنَّ سُنَّةً سيَّئة كانَ عليه وزرها ومثل وزرِ مَنْ عَملَ بِها مِنْ غَيْرِ أن يَنقُصَ مِنْ أوزارِهِمْ شيء**)). واتە : هەرکەسێك لە چوارچێوەی ئیسلامدا رێچکە و رێبازێکی باش دابێنێت ئەوە پاداشتی ئەوە و هەموو ئەو کەسانەشی دەدرێتەوە کە ئەو کارە جوانە لەوەوە فێردەبن و دەیکەن، بە پێچەوانەشەوە هەرکەسێك نمونەیەکی ناراست و خراپ نیشان بدات‌و خەڵك بکەونە ژێرکاریگەری ئەوا ئۆباڵی خۆی و هەموو ئەو کەسانەی ئەو کارە دەکەن، دەکەوێتە ئەستۆی ئەو.

بۆیە لاوێکی باوەڕدار دەبێت هەر لە تاڤ لاوێتییەوە خۆی لەسەر ئەوە پێ بگەیەنێت کە نەك هەر خۆی نمونەی رەفتار و ئاکار جوان بێت، بەڵکو لەم رووەوە کار لەسەر دەوروبەرەکەشی بکات و ببێتە هێمایەکی چاکەخوازی و میهرەبانی و خزمەت و خۆشەویستی و پەرۆشی بۆ کەسانی تر .

بۆ ئەوەی مرۆڤ لەم روەشەوە سەرکەوتوو بێت هەڵبژاردنی هاوڕی هەمیشەییەکانی گرنگە. دەبێت کەســـانێك بکات بە هاوڕێی خۆی و راز و نیازیان لەگەڵ بگۆڕێتەوە لە رووی رەوشتییەوە لەکەدار نەبن و خراپەکار نەبن بۆ ئەوەی بە خراپەکانیان کاریگەر نەبێت، پێغەمبەر(دخ) دەفەرموێت:((**المرء على دين خليله، فلينظر أحدكم من يخالل** ))(ترمزی ریوایەتی کردووە).واتە مرۆڤ لەسەر رێبازو رێچکەی هاوڕێکەیەتی. بۆیە دەبێت بزانێت کە کێ دەکات بە هاوڕێی خۆی زۆر گرنگە مرۆڤ هاوڕێیەتی کەسانی بە هیممەت‌و ورە بەرزو بە ئیرادەو گەشبین‌و ئەرێنی‌و سەرکەوتوو بکات. بۆ ئەوەی لە ژینگەیەکدا بژی بەرەو نەفس بەرزی و سەرکەوتوویی ماددی‌و مەعنەوی بەرێت‌و، بتوانێت یارمەتی ئاستەکانی تریش بدات بۆ ئەوەی چاو لە ژینگەیەکی رەوشت بەرزترو رەوشتی دیکەو سەرفرازتر بڕن.

خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەرو سەرکردە و پیشەوا مەزنەکانی مێژووش سودێکی زۆر بە مرۆڤ دەگەیەنێت، چونکە لە ئەزموونی ئەوانەوە فێری زۆرشت دەبێت‌و هانی دەدەن بۆ هیممەت بەرزی و ئاکار جوانی، لە هەموو ئەوەی باسمان کرد دەگەینە ئەوەی ئەرکی لاوی باوەڕدار و هەموو مرۆڤێکی ژیر و چاکەخوازە لە ژیانی خۆیدا چاو لەو کەسانە بکات بە رەوشت بەرزیو شایستەییو ئامانج بەرزی ناسراون‌و خۆشی ببێتە سەرمەشقێکی باش بۆ دەوروبەرەکەی.

**پرسیار :**

١. گرنگی پەروەردەی رەوشتی لە چیدایە ؟

٢. چۆن سود لە سەرمەشقە رەوشت بەرزەکان وەربگرین ؟

**گفتوگۆ :**

چۆن خۆمان ڕۆڵمان لە پەروەردەکردنی رەوشتی خۆماندا هەبێت ؟



**وانەی دەیەم**

## ئیسـلام و مافـەكـانی مرۆڤ

ئەمڕۆ مافەكانی مرۆڤ لە جیهاندا بایەخێكی زۆری پێ دەدرێت وجاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤیش بە یەكێك لە دەسكەوتەكانی مرۆڤایەتی لە سەدەی بیستەمدا دادەنرێت، ئێمە لەم بەشەدا هەوڵدەدەین بە كورتی لە روانگەی بیری ئیسلامییەوە باسی ئەم مافانە بكەینو هەندێك لە مافەكانیش بە درێژی بخەینە ڕوو.

**پێناسەی مافەكانی مرۆڤ و بەشەكانی:**

مافەكانی مرۆڤ بریتین لەو مافانەی كە مرۆڤ بە حوكمی ئەوەی مرۆڤە دەستی دەكەوێت و لێیان بەهرەمەند دەبێتو لەگەڵ لەدایك بوونیدا لە دایك دەبنو بە كۆچی دواییشی كۆتاییان پێدێت، بە مەبەستی پارێزگاری كردن لە قەوارەو كەسێتیو پاراستنی خۆی و ئەو بەهایانەی بەوەوە بەندن.

كەواتە مافەكانی مرۆڤ هەروەك لە پێناسەكەشدا دەردەكەوێت، لەسەر بیرۆكەیەكی بنەڕەتی دادەمەزرێت، كە ئەویش مرۆڤ بوونی مرۆڤە. واتە مرۆڤ بە حوكمی مرۆڤ بوونی و بەدەر لە رەنگو روخسارو رەگەز (واتە نێرو مێ)و نەتەوەو نەژادو ئایینو رەگەزو پێگەی كۆمەڵایەتی، خاوەنی كۆمەڵێك مافی خودا پێداوو و سروشتییە و پەیوەستە بە خودی مرۆڤ بوونی ئەوەوە وبۆ هیچ كۆمەڵگە و دەوڵەتو هێزێك نیە ئەم مافانەی لێ زەوت بكات. چونكە مافەكانی دەكەونە پێش دروست بوونی دەوڵەت و كۆمەڵگەشەوە . بەڵكو لەسەر هەموو دەسەڵات و حوكمەتێك پێویستە بەدەقی یاسا و بە كردەوە بیانپارێزێت و كەش و هەوایەك بخوڵقێنێت مرۆڤ لێیان بەهرەمەند بێتو سودیان لێ وەربگرێت، دەنا بە دەسەڵاتێكی نادادپەروەر و ستەمكار لە قەڵەم دەدرێت.

### ئیسلام وكەرامەتی مرۆڤایەتی و مافەكانی مرۆڤ

كەرامەتی مرۆڤ سەرچاوەی سەرجەم مافە بنەڕەتیەكانیەتی، كەرامەت بەڵگەی مرۆڤایەتی مرۆڤە كە لە ئاژەڵ و گیانلەبەرانی دیكە جیای دەكاتەوە، كەرامەتی مرۆڤ گەورەترین پاساو و هاندەری مرۆڤ بووە لە مێژوودا بۆ جێ‌لێژكردن بە دابو نەریتو یاسا توندو تیژەكان و گۆڕانیان بە رێسا ئاینییە میهرەبانەكانو یاسا نەرمەكان .لە (**جاڕنامەی گەرودنی مافەكانی مرۆڤ**) یشدا كە لەساڵی ١٩٤٨ دەرچووە، هاتووە : (( داننان بە كەرامەتی خوداپێداو و یەكسانی مرۆڤەكان وە بە مافە چەسپاوە یەكسانەكانیان، بریتییە لە بناغەی ئازادی و دادپەروەری و ئاشتی لە جیهاندا )) .

لە (**بەیاننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و سیاسی**) یەكانیشدا كە ساڵی (١٩٦٦ )دا دەرچووە، هەمان بۆچوون دوبارە كراوەتەوە و تیایدا هاتووە :((هەموو ئەم مافانە لە كەرامەتی یەكسانی مرۆڤەكانەوە سەرچاوەی گرتووە)).

دوای ئەوەش ڕێزگرتنی ئەم کەرامەتە لە کاتی چەسپاندنی سزای یاسایشدا بە پێویست داناوە، کەواتە کەرامەتی **مرۆڤ** سەرچاوەی سەرەکیی و گەورەیی مافەکانی مرۆڤە.

ئاینە ئاسمانیەکان هەمیشە جەختیان لەسەر کەرامەتی خوداپێداوی **مرۆڤ** کردۆتەوە، قورئان کەرامەتی مرۆڤی بە یەکێك لەو نیعمەتانە داناوە خودای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە و بە هۆی ئەویشەوە فەزڵو ڕێزی بەسەر تەواوی بەدیهێنراوەکانی دیکەی خۆی لەم گەردونەدا داوەو مرۆڤی کردوە بە سەرداری بوونەوەر:((وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً)) (الاسراء٧٠). واتە: ئەم ڕێز لێنانەش لە **مرۆڤ** کردویەتی بە جێنشین لەسەر زەوی و، تەواوی خێرو بێرەکانی ئاسمان و زەوی خستۆتە بەردەست.

کەرامەتو ئەم بەخششانەی خوداش بۆ هەموو مرۆڤێکە بە حوکمی **مرۆڤ** بوونی و بێ ئاوڕدانەوە لە ڕەچەڵەك و بنەچەو ڕەگەزو ڕەنگو نەژادو ئاینو پێگەی کۆمەڵایەتی، چونکە خودای گەورە کەرامەتی بە جۆری (جنس) ی **مرۆڤ** بەخشیوە نەك بە دەستەیەك لەوان، بۆ نمونە بە باوەڕداران یاخود بە پیاوان و ئەوانی دیکەی لێ بێ بەش بن، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە مرۆڤایەتی بە سەرجەم ئاینو نەتەوەو زمانو ڕەگەزو ڕەنگەکانیەوە یەك سەرچاوەیان هەیە و لە یەك ( نفس) کەوتوونەتەوەو خودای گەرەش کەرامەتی بەو ( نفس) ە بەخشیوە.هەر بۆیە کاتێك پێغەمبەر(دخ) لەبەر تەرمی جولەکەیەك وەك ڕێز گرتن هەڵدەستێت، یەکێك لە هاوەڵەکانی پێی دەڵێت : ئەی پێغەمبەری خودا ئەو تەرمە جولەکەیە ( وەك ئەوەی پێی بڵێت شایەنی ئەوە نییە پێغەمبەرێکی خودا لەبەری هەڵبستێت) بەڵام پێغەمبەر (دخ) بە ئیلهام وەرگرتن لەو (نفس) ەی سەرەتاو کەرامەتی یەکسانی خوداپێداوی **مرۆڤ** بە مرۆڤەکان، وەڵامی دایەوە و فەرمووی : **أَلَيسَ نَفْسـاً ؟** . ئایە (نفس) نیە؟ واتە: **مرۆڤ** نیە ؟ کە دیوی دووەمی نەوتراوی فەرمودەکە روونەو ئەوە دەگەیەنێت چونکە بە هەناسەی خودا ژیاوەو مرۆڤەو مرۆڤیش بە حوکمی **مرۆڤ** بوونی بەدەر لە ئاین و مەزهەب و ڕەنگ و زمانی دەبێت ڕێزی لێ بگرینو سوکایەتی پێ نەکەین.

سەبارەت بە دادپەروەریش ئەوەندە بەسە کە بزانین خودای گەورە ئامان لە ڕەوانەکردنی سەرجەم پێغەمبەرانی خۆی لە مێژوودا لە بەرپاکردنی دادپەروریدا کورت کردۆتەوەو دەفەرموێت:(( لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ...)) (الحدید٢٥) واتە: ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان بە بەڵگەی ئاشکرا و روونەوە ڕەوانە کردنو، کتێبو تەرازوومان لەگەڵ ناردونەتە خوارەوە بۆ ئەوەی خەڵکی دادپەروەری بەرپا بکەن.

دادپەروەریش یەکسانی لە خۆ گرتووە، واتە یەکسانی بەشێکە لە دادپەروەری، هەروەکو چۆن (ئازادی) یش بەشێکی دیکەیەتی، یەکسانیش لێرەدا واتە سەرجەم مرۆڤەکان لە نەوەی ئادەمنو یەك دایك و باوکیان هەیە، ئادەمیش لە خاك دروست کراوە، بەم جۆرەش هەموویان لەبەردەم یاسادا یەکسانن و

هەمووشیان شایستەی ئەوەن ببنە خاوەنی ئەو مافانەی بۆ مرۆڤ دیاریکراون، یەکسانی مرۆڤەکانیش لە کەرامەت و مرۆڤایەتیدا پایەیەکی گەورەی مافەکانی مرۆڤە .

هەروەها لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە، خودای گەورە دەفەرمویٚت :((يا عِبادي : إنّي حَرَّمْتُ الظُلْمَ على نَفسِي، وَ جَعَلْتَهُ بَينَكُمْ مُحَرَّماً فَلا تَظَالَمُوا)). واتە: ئەی بەندەکانم بە راستی من ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووە ، لە نێوان ئێوەشدا حەرام و قەدەغەم کردووە بۆیە ستەم لە یەکدی مەکەن.

مافەکانی مرۆڤیش لەم سەردەمەدا ئەگەر جوان جێ بەجێ بکرێن تا رادەیەکی زۆر رێگە لەوە دەگرێت مرۆڤەکان ستەم لە یەکدی بکەنو دەسەلاٚتە ستەمکارەکان دابمەزرێن و بێنە کایەوە.

**پرسیار** :

١. ئیسلام چۆن دەڕوانێتە کەرامەتی مرۆڤ ؟

٢. ئایە لە ئیسلامدا جیاوازی لە نێوان کەرامەتی مرۆڤ و مرۆڤێکی دیکە هەیە ؟

## وانەی یانزەم

## دەســـــتە بەرییەکانی

## ئیسلام بۆ مافی ئاسایشی تاکەکەس

ئیسلام مافی ئاسایشی تاکەکانی هەروا بە گشتی وەك بنەمایەك مسۆگەر نەکردووە. بەڵکو کۆمەڵێك ڕێسای داناوە بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی بە تایبەتیش لە بواری یاسا و دادگاکاندا لە گرنگترین ئەو دەستەبەریانەش ئەمانەی خوارەوەن:

١ – بنەمای کەسێتی بوونی لێپرسراوێتی تاوانکاری (مبدأ شخصية المسؤولية الجنائية)ئەویش ئەوەیە کە هەموو کەس لە کردەوەکانی خۆی لێپرسراوە و لە تاوانی کەسێکی دیکە لێی ناپرسرێتەوە و بە هۆی خراپەی یەکێکی دیکە سزا نادرێت:(( وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ...)).(فاطر١٨) واتە: هیچ کەس ئۆباڵی تاوانی کەسی دیکەی ناکەوێتە ئەستۆ .

پێغەمبەریش(دخ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت :((لا يؤخذ الرجل بجريرة ابيه ولا بجريرة أخيه)). واتە: مرۆڤ بەهۆی تاوانی باوکی یاخود براکەیەوە لێی ناپێچرێتەوەو دووچاری لێپرسراوێتی نابێت، لێرەشەوە رەفتاری دوژمنایەتی لە ناو خێڵەکانداو رەفتاری دەسەڵاتە ستەمکارەکان کە کەس و کاری مرۆڤ لەسەر هەڵوێست یاخود تاوانی کەسێك خێزانێك یاخود بنەماڵەو خێڵێك ئازار دەدەن و ئاسایشی ژیان و شەرەفو ماڵیان دەخەنە مەترسییەوە، نائیسلامی و ناڕەوایە.

٢ – مافی شەرعی بوون یاخود یاسایی بوونی سزا و تاوانەکان: واتە: هیچ تاوانێك سزای لەسەر نیە مەگەر لە پێش ئەوەوە مرۆڤەکان لە ئەنجامنەدانی هۆشیار نەکرابنەوە و قەدەغە بوونی ڕانەگەیەنرابێت. ئەمەش لە یاسای دانراوی سەردەمدا بە بنەمای : ( هیچ تاوان و سزایەك بە گوێرەی یاسا نەبێت بوونی نیە ) ناودەبرێت، چەندین ئایەت و فەرمودەمان هەیە جەخت لەسەر ئەم بنەمایە دەکەنەوە:((... وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً))(الاسراء١٥) واتە: هیچ گروپو نەتەوەیەکمان سزا نەداوە پێش ئەوەی پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە بکەینو حەڵاڵو حەرامیان بۆ ڕوون بکاتەوە.

بە گوێرەی ئەمەش ئیسلام لایەنگری دەوڵەتی یاسایە و نابێت کەس لە دەرەوەی یاسایەکی پەیڕەوکراوی دادپەروەرانەو بنەما شەرعیەکان دووچاری لێ پێچینەوە بێتو مافو ئەرکەکانی فەرمانڕەواو هاوڵاتیانیش ڕونو ئاشکرا بێت.

٣ – بنەمای نەگەڕانەوەی کاریگەری یاساکانی سزادان بۆ پێش دەرچونیان (مبدأ عدم رجعية القوانين): چونکە خەڵکی لە کاتێکدا لە مافو ئازادیەکانی خۆیان بەهرەمەندن لەو کاتانەی ئەوەی دەیکەن ڕێ پێدراوە و هیچ قەدەغەیەکی یاسایی لەسەر نیە، ئەگەر ئەم بنەمایە نەبوایە دەترسان لەوەی لە دواڕۆژدا ئەم ڕەفتارانە بە یاسا قەدەغە بکرێن و لەسەری سزا بدرێن و بەمەش هەستیان بە دڵنیایی نەدەکرد.

کاتێك زینا و دزی و خواردنەوە و بوختان کردن لە قورئاندا حەرام کران ئەو دەقانەی لەم روەوە دابەزین بەسەر ئەم رەفتارانەدا لە پێش دابەزینەکەدا جێ بەجێ نەکران‌و لە دوای ئەوەوە دەست بە پیادە کردنیان کرا .

٤ - بنەمای لە بنەڕەتدا هەموو کەس بێ تاوانە :

لە روانگەی ئیسلامەوە هەموو مرۆڤێك بێ تاوانە تا لە رێی رێ‌و شوێنە یاسایی‌و دادگاییەکانەوە تۆمەتێکی بەسەردا ساغ دەبێتەوە، پێغەمبەر(دخ) دەفەرموێت:((**كُلُّ مَولُودٍ يُولَدُ عَلَى الفطرة**)). واتە: هەموو منداڵێك بە پاکی لەدایك دەبێت‌و هیچ تاوان‌و خراپەیەکی لەگەڵ لەدایك نابێت.

یەکێك لە بەرەنجامەکانی ئەم بنەمایەش ئەوەیە ئەگەر یەکێك باسی ئەوە بکات مافی بەلای یەکێکی دیکەوەیە، دەبێت ئەم داواکارە بەڵگە و شایەت بێنێت بۆ چەسپاندنی داواکەی و کەسی شکات لێکراو داوای بەڵگەی لێ ناکرێت بۆ رەت کردنەوەی ئەو داوایە ، چونکە لە بنەڕەتدا وا دانراوە کە مافی کەسی لا نیە، هەروەها یەکێکی دیکە لە بەرەنجامەکانی بنەماکە ئەوەیە ئەگەر گومانێك لە کێشەیەکدا هەبوو لە بەردەم دادگا بە قازانجی لایەنی سکالالێکراو و تۆمەتبار لێکدەدرێتەوەو یەکلایی دەکرێتەوە.

**پرسیار:**

١. بۆچی بۆ بەهرەمەند بوون لە مافی ئاسایش پێویستیمان بە کۆمەڵێك دەستەبەرییە ؟

٢. بوونی دەستەبەریەکان لە ئیسلامدا بۆ بەهرەمەند بوون لە مافی ئاسایش چی دەگەیەنێت ؟

## وانەی دوازدەم

### ٣ - مافی یەکسانی :

بنەمای یەکسانی بنەمایەکی بنەڕەتی ئاینە ئاسمانیەکانو بیرۆکەی مافەکانی مرۆڤیشە، ئاینە ئاسمانیەکان جاڕی ئەوەیان دا کە بەندەکان لەبەردەم خودادا یەکسانن، ئیسلام لە کەرامەت و مافەکاندا یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا بڕیاری داوە و هەر هەڵاواردنێك لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر بناغەی ڕەنگو نەژادو ڕەگەزو زمان ڕەتدەکاتەوە، مرۆڤایەتی بە گشتی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە یەك بنەڕەتی هەیە و لە یەك دایك و باوکەوە پەیدا بووە، هەروەك قورئان دەفەرموێت:(( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ)) (الاعراف١٨٩) واتە: ئەو خودایەی ئێوەی لە یەك (نفس) و بنەڕەتەوە بەدیهێناوە :(( يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)) (الحجرات١٣). واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك بەدیهێناوە، وە کردومانن بە هۆز و گروپو گەلی جیاواز بۆ ئەوەی یەکدی بناسن وە بە میهرەبانی مامەڵە لەگەڵ یەکدی بکەن. بە ڕاستیش بەڕێزترینتان لای خودا (بۆ ئەو دونیا) ئەوەتانە کە زۆرتر خۆپارێز و چاکەکار بووە.

ڕووی ئایەتەکە لە هەموو خەڵکییە(يَا أَيُّهَا النَّاسُ) نەك تەنها باوەڕداران‌و جەخت لەسەر یەکبوونی بنەڕەتی سەرجەم مرۆڤایەتی دەکاتەوە. پێغەمبەر (دخ) لە چەندین فەرموودەی خۆیدا گرنگی بنەمای یەکسانیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

هەروەك دەفەرموێت:((أيها الناس ان ربّكم واحد، وان أباكم واحد، كلكم لآدم و آدم من تراب، ان أكرمكم عند الله أتقاكم، لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأعجمي على عربي، ولا لأسود على أحمر ولا لأحمر على أسود إلاّ بالتّقوى، اللّهم هل بلغت اللّهم فاشهد ، ألا فليبلغ الشاهد منكم الغائب)). واتە: ئەی خەڵکینە (هەموو خەڵکی بەبێ جیاوازی ئاین‌و ڕەگەزو ڕەنگ‌و زمان) بە ڕاستی پەروەردگارتان یەکە، و باوکتان یەکە، هەمووتان لە ئادەمن‌و ئادەمیش لە خۆڵە، بەڕێزترینتان لای خودا خۆپارێزترین‌و چاکەکارترینتانە، با بزانن عەرەب ڕێزی نیە بەسەر غەیری عەرەبدا، غەیری عەرەب ڕێزی نیە بەسەر عەرەبدا، ڕەشپێست ڕێزی نیە بەسەر سوور پێستدا، سوورپێستیش ڕێزی نیە بەسەر ڕەش پێسدا، بە خۆپارێزی‌و چاکەکاری نەبێت، خوداوەندە ئەوە من پەیامەکەی تۆم گەیاند و تۆش شاهید بە لەسەری، با ئەوەتان لێرەیەو ئامادەیەو ئەم پەیامەی بیست، بیگەیەنێت بەوانەی نەیانبیستووە و لێرە نین.

لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا مرۆڤی پلە یەك و پلە دوو نیە، هەموو مرۆڤێك بەدیهێنراوی خودای گەورەیە و بەو هەناسەیە زیندووە کە خودای گەورە پێی بەخشیووە و کەرامەتی مرۆڤی هەیە. ڕێز و پلە و پایەش بە ڕەچەڵەك و بنەچە و نەتەوە و ڕەنگ و زمان و هۆز و بنەماڵە نیە، بەڵکو بە شتێکە کە لەبەر دەستی هەموواندایە و هەر مرۆڤێکیش دەتوانێت سوودی لێ وەربگرێت و پەیوەندی بە ئیرادەی خۆیەوە هەیە کە ئەویش تەقوا و چاکەکارییە .

هەژار و دەوڵەمەندێك سپی پێستو رەش پێستێك، كورد و عەرەب و هەر نەتەوەیەكی دیكە، لەبەردەم یاسای خودادا یەكسانن، پێویستە ئەم هەست بە یەكسانی كردنەش لە ناخی هەر یەكەماندا بە قوڵی بچەسپێت.

## جۆرەكانی یەكسانی

بنەمای یەكسانی كۆمەڵێك لقی لێ دەبێتەوە و چەند جۆرێكی هەیە بەم جۆرانەی خوارەوە :

**أ- یەكسانی لەبەر دەم شەرع و یاسادا :**

ئیسلام پێشەنگ بووە لە بڕیاردانی مافی یەكسانی لە بەر دەم شەرعو یاسادا ، خەڵكی هەموویان لە پەیوەندی بە ماف و ئەركەكانەوە مامەڵەیەكی یەكسانیان لەگەڵدا دەكرێت و لە بەردەم هەمان دادگاو یاسادا دادوەرییان لەگەڵدا دەكرێت، لە پیادەكردنی حوكمە شەرعیو یاساییەكاندا كەس هەڵاناوبردرێت و جیا ناكرێتەوە .

هیچ كەسیش بێ بوونی بیانویەكی شەرعی و یاسایی كە یاسا خۆی دیاری دەكات لە پیادەكردنی یاسا نابوردرێت، لەبەر ئەوە چینایەتی و دەستەگەرایی و تایەفەگەری و رەگەز پەرستی لە ئیسلامدا بوونیان نییە و شوێنیان نابێتەوە .

پێغەمبەریش(دخ) لە فەرموودەیەكدا جیاوازی كردن لەنێوان هەژارو دەوڵەمەندەكاندا لەكاتی پیادەكردنی یاسا بە سەرچاوەی تیاچوونو كارەساتی نەتەوەو شارستانیەتەكان دەزانێتو دەفەرموێت:(( انّما اهلك الذين قبلكم انّهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه و اذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد، وأيْمُ الله لو انّ فاطمةَ بنت محمد سرقت لقطعتُ يدها )).واتە: خەڵكانی پێش ئێوە بەوە تیاچوون كە هەركاتێك پیاوماقول و نەجیب زادەیەك دزی بكردایە وازیان لێ دەهێنا، وە كاتێك هەژارو بێ دەستەلاتێك دزی بكردایە یاسایان بەسەردا جێ بەجێ دەكرد، بەڵام با ئێوە بزانن سوێند بەخودا ئەگەر فاتیمەی كچی موحەممەد دزی بكات ئەوا یاسای بەسەردا جێ بەجێ دەكەم.

لاپەرە گەشەكانی مێژوی ئیسلامیش پڕە لەو نمونانەی یەكسانی مرۆڤەكان لەبەر دەمی یاسادا دەخەنە روو، بۆ نمونە پێشەوای چوارەمی موسوڵمانان (عەلی كوڕی ئەبە تالیب) جولەكەیەك سكاڵای لە دادگا لەسەر تۆمار دەكات و بەوە تاوانباری كردووە كە زرێكەی لێ بردووە ، ئەویش لەگەڵیدا دەچێتە بەردەم دادگا و رازیش نابێت دادوەر هیچ مامەڵەیەكی لەگەڵدا بكات لە بەرامبەرەكەی جیای بكاتەوە، لە سۆنگەی ئەو قەناعەتەی بە دادپەروەری ئیسلام و یەكسانی هەمووان لەبەردەم دادگا هەیبووە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە لە روانگەی ئیسلامەوە فەرمانڕەوا و هاوڵاتی وەك یەك یاسایان بەسەردا پیادە دەكرێت و هیچ كەسێك و بە هیچ پاساوێك لەسەرو شەرع و یاساوە نیە.

### ب - یەکسانی لەبەر دەم دادگادا:

ئەگەر یەکسانی مانایەکی دادپەروەری بێت، وە دادپەروەریش مەبەستی هەرە باڵای ئیسلام بێت، ئەوا یەکسانی سەرجەم هاوڵاتیان لەبەردەم دادگادا بەرەنجامێکی سروشتی بنەمای یەکسانیانە لە بەردەم شەرع و یاسادا. ئەم بنەمایەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرجەم هاوڵاتیان دەبێت مل کەچی دادگا بن‌و کەس نابێت لەم روەوە مافی تایبەتی هەبێت‌و لەم رێسا گشتییە جیا بکرێتەوە، لە جۆری لێکۆڵینەوە لە تاوان‌و دەستەبەرییە یاساییەکان‌و لە سپاندنی سزاشدا دەبێت هەمووان یەکسان بن، لە وتەی پێشەوا( عومەری کوڕی خەتتاب)یشدا(رخ)کە بۆ دادوەری ئەبو موسای ئەشعەری ناردووە هاتووە:((آسِ بين الناس في مجلسك ووَجهك حَتَّى لا يطمَعَ شريفٌ في حَيْفك ولا يَخافَ ضعيفٌ من جَورك)). واتە: لە دادگادا لە کۆڕ و دادپەروەری و جۆری سەیر کردنتدا بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە بۆ ئەوەی ناودار و پیاوماقوڵێك چاو نەبڕێتە بێ‌عەدالەتیت‌و بێ دەستەڵات‌و زەبونێکیش لە دادپەروەریت نائومێد نەبێت.

دادوەر دەبێت دەرفەتی یەکسان بە لایەنەکانی کێشەیەك بدات بۆ ئەوەی هەوڵی سەلماندنی بۆچوون و داواکانیان بدەن لەم روەوە پێغەمبەر (دخ) کاتێك ( عەلی کوڕی ئەبی تالیب)ی بە دادوەر نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو:((فاذا جلس بين يديك خصمان فلا تقضين حتى تسمع كلام الآخر كما سمعت كلام الأول)).

واتە: هەر کاتێك دووکەس سکاڵایان دژ بەیەك هەیە لە بەر دەمتا وەستان پێش بیستنی قسەی هەردووکیان دادوەری لە نێوانیاندا نەکەی .

### ج -یەکسانی لە گرتنە دەستی پلە و پایە گشتی یەکاندا( الوظائف العامة ) .

ئیسلام لێهاتوویی و دەست پاکی و دڵسۆزی کردۆتە پێوەری گرتنە دەستی پلە و پایە گشتییەکان و ئەم مافەش مافی تایبەتی هیچ توێژ و چین و گروپێکی دیاریکراو نیە ، گرنگ ئەوەیە کەسی شیاو لە شوێنی شیاودا بێت و دادپەروەری پیادە بکرێت و خزم خزمێنە و نایەکسانی و گەندەڵی و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لە ئارادا نەبێت. خودا دەفەرموێت:((... إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ)) (القصص٢٦) قورئان لەسەر زمانی کچەکانی شوعەیب پێغەمبەر (سڵاوی خودای لێ بێت) سەبارەت بە موسا پێغەمبەر، دەفەرموێت: باشترین کەسە بە کرێی بگریت چونکە بەتوانا و دەست پاك و سەر راستە.

پێشەوا(عومەری کوڕی خەتتاب)یش(رخ) دەربارەی هەندێك لە مەرجەکانی دیاریکردنی کاربەدەستەکانی دەوڵەت دەڵێت:((أريد رجلاً إذا كان في القوم وليس أميرهم كان كأنه أميرهم، و إذا كان أميرهم كان كأنه رجلٌ منهم)). واتە: من کەسێکم دەوێت بیکەم بە کاربەدەست کە پێش کار بەدەست بونی وەك کار بەدەست وابێت و دوای کار بەدەست بوونی وەك هەر یەکێکی تر لە هاوڵاتیان وا بێت ، هەروەها لە

نامەیەکدا بۆ (سەعدی کوڕە ئەبی وەقاص )دا نوسیویەتی:((ان الله لیس بینه و بین أحد نسب إلاّ بطاعته و الناس شریفهم و وضیعهم في ذات الله سواء)).

واتە: خودا خزمایەتی لەگەڵ کەسدا نیە، بە پەرستن و گوێڕایەڵی نەبێت، خەڵکی ئەشراف و ناودار و بێ کەس و نەناسراو لەبەردەم خودادا یەکسانن.

## د - یەکسانی لە عیبادەت و ئەرکە گشتییەکاندا:

ئیسلام لە رووی عیبادەت و ئەرکە گشتییەکانەوە جیاوازی لە نێوان خەڵکیدا ناکات، دەوڵەمەندەکان جۆرێك خودا پەرستییان نیە و هەژارەکان جۆرێکی دیکە، یاخود پیاوان بە جۆرێك و ژنان بە جۆرێکی دیکە، هێندە هەیە هەندێك ئاسانکاری بۆ هەندێك کەس و توێژ کراوە بۆ چەسپاندنی داد پەروەری لەوانەش هەڵگرتنی زەکات و حەج لەسەر کەسانی هەژار.

**پرسیار:**

١. ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی چۆن دەڕوانێتە یەکسانی نێوان مرۆڤەکان ؟

٢. ئایە لە ئیسلامدا هیچ ڕەگەز و گەل و نەتەوەیەك ڕێزی بەسەر ئەوی دیکەدا هەیە؟ ئەگەر نیە بۆ ؟

٣. هەستکردن بە یەکسانی چ کاریگەریەکی لەسەر مرۆڤی باوەڕدار هەیە ؟

## وانەی سێزدەم

### ٤ - ئازادی بیروباوەڕ و ئاین

ئازادی بیروباوەڕ و ئاین واتە مرۆڤ ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕ و ئاینو بۆ هیچ هێزو دەسەڵاتو کەسێك نەبێت لە دەرەوەی قەناعەتو ئیرادەی ئازادی خۆیەوە بیروباوەڕێکی بەسەردا بچەسپێنێت.

ئیسلام لە سەردەمێکدا کە بەزۆر سەپاندنی ئاینو بیروباوەڕ لە زۆر شوێنی دونیادا باو بوو جاڕی ئازادی باوەڕهێنانو ئاینو بیروباوەڕیدا و دژی زۆرلێکردن(**إکراه**)و دەمارگیری ئاینیو بیروباوەڕی وەستایەوە ، ئەم بنەما بەرز و ئازادیەش لە چەندین ئایەت و فەرمودەدا چەسپیوە،((لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ)) (**البقرة٢٥٦**) واتە: زۆرکردن لە ئایندا نیەو کەس نابێت بە زۆر بکرێت بە موسوڵمان ڕێگەی ڕاست و گومڕایی لە یەکدی جیاکراوەتەوە و مرۆڤ ئازادە کامیان هەڵدەبژێرێت .هەروەها بەرامبەر بە پێغەمبەر(دخ) دەفەورموێت:((وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ))(یونس٩٩) واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوا هەرچی وا لەم زەویەدا سەرجەم باوەڕیان دەهێنا ، ( بەڵام ئەو ئەمەی نەویستوە و ئازادی باوەڕهێنانی داوەتەوە دەست مرۆڤەکان خۆیان) ئایە تۆ زۆر لە خەڵکی دەکەی تا ببنە باوەڕدار ؟ ڕوونە کە پرسیارەکە بۆ سەرسوڕمانە و ئەوە دەگەیەنێت کە خودای گەورە ئەو مافەی پێ نەداویت و ئەوەی لەسەر شانتە جوان و ڕون ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەیە کە خودا بۆی ڕەوانە کردوی:(( وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ ...))(آل **عمران٢٠**) واتە: بڵێ بەوانەی کتێبیان بۆ ڕەوانە کراوە و ئەوانەش کە بۆیان ڕەوانە نەکراوە، ئایا موسوڵمان بوون ؟ ئەگەر موسوڵمان بوون ئەوە ڕێنمایی خودایان وەرگرتووە، و خۆ ئەگەر پشتیان لە بانگەوازی خودا هەڵکردووە و باوەڕیان پێ نەهێناوە، ئەوە بزانە کە ئەوەی لەسەر شانی تۆیە تەنها ڕاگەیاندنی پەیام و بانگەوازەکەیە نەك شتێکی دیکە .

چونکە خودا ئازادی هەڵبژاردنی ئاین و باوەڕی بە مرۆڤ بەخشیووە و لە بەرامبەر ئەو ئازادیەشەوە بەرامبەر بە خودا لە ڕۆژی دواییدا لێپرسراوی کردووە، ئەوەی ئەرکی پێغەمبەر(دخ)و زاناو بانگخوازانی دوای ئەوە تا ڕۆژی دوایی ڕونکردنەوەی هەق و ڕاستیەکان و ئامۆژگاری و هەوڵدانە بۆ قەناعەت پێکردنی مرۆڤەکان، بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕاستی خودا بگرن:(( وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ ...))(الکهف٢٩) واتە: ئەی محمد تۆ ئەو هەقەی لەلایەن خوداوە هاتووە بە خەڵکی بگەیەنە، دوای ئەوە هەر کەس خواستی با باوەڕبێنێتو هەر کەسێکی دیکەش ویستی با کافرو بێ باوەڕ بێت.

وەك بەشێك لەو دەستەبەریانەی قورئانیش بۆ ئازادی ئاین و پەرستنو پاراستنی مافی ئەوی دی ئاینی و شوێنکەوتەی ئاینەکانی دیکەو بە تایبەتیش ئاینە ئاسمانیەکان ختسویەتیە ڕوو لە موسوڵمانانی

قەدەغە كردووە هیچ شێوازێكی نادروست لەكاتی مشتو مڕ كردندا بەرامبەر خاوەن پەیامەكانی دیكە بەكار بێنن:((وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ)) (العنكبوت٤٦) واتە: بە باشترین شێواز نەبێت مشتو مڕ لەگەڵ خاوەن ئاینەكانی دیكە نەكەن.

لەبەر روناكی ئەم بنەماو دەقە پیرۆزو بەرزانەی ئیسلامو شەریعەتەكەی، ئازادی پەرستنی بۆ شوێنكەوتووی ئاینەكانی دیكە دەستەبەر كردووە، بۆیە قەدەغەی كردووە لە موسوڵمانان دەستدرێژی بكەنە سەر پەرستگەو بیروباوەڕیانو بۆیان هەیە لە بواری بیروباوەڕ و باری كەسێتیدا بەگوێرەی ئاینەكانی خۆیان بجوڵێنەوەو تەنانەت هەندێك شت كە لە ئیسلامدا حەرامەو لە هەندێك لە ئاینەكانی دیكەدا حەرام نەكراوە وەكو مەی خواردنەوە و خواردنی گۆشتی بەراز لێیان قەدەغە ناكرێت، لە رووی مێژوییشەوە وڵاتانی ئیسلامی بە بەراورد لەگەڵ بەشەكانی دیكەی جیهاندا فراوانترین ئازادی ئاین و بیروباوەڕی تیدا بووە، تەنانەت لەسەردەمی عەبباسیەكاندا زانای ئاینە جۆراوجۆرەكان و هەندێك جار بێباوەڕەكانیش لە مزگەوت و خوێندنگە و كۆشكی سوڵتاندا بە شێوەیەكی زانستی گفتوگۆیان لەسەر ئاینەكان كردووە .

بە كورتی ئیسلام ئازادی بیروباوەڕ و ئاینی بۆ ناموسوڵمانەكان دەستەبەر كردووە، و ئازادی خواپەرستی پێ داون و زانایانیش لەم بارەیەوە رێسای گشتییان لە قورئان و فەرمودەكان هەڵێنجاوە كە دەڵێن (اتركوهم و ما يدينون) واتە: وازیان لێ بێنن با بەگوێرەی ئەو ئاینەی باوەڕیان پێیەتی خواپەرستی بكەن و ژیان و رەفتاری خۆیان رێكبخەن. لە رووی مێژووییشەوە ئیسلام خاوەنی دروشمی زێڕینی زۆر لێكردن لە ئایندا نیە (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) تەنانەت دووڕووەكانیش لە ژێر سایەی ئیسلامدا ئازادییان پارێزراو بوو لە كاتێكدا جەنگی دەرونیان دژ بە موسوڵمانان بەرپا كردبوو وە بە شێوازی ناشیرین باسی پێغەمبەر (د.خ) و باوەڕدارانیان دەكرد، هەر بۆیە نە بە زۆر كەسێك دەكاتە موسوڵمانو نە موسوڵمانێكیش بە زۆر لەناو بازنەی ئیسلامدا دەهێڵێتەوە چونكە باوەڕ پەیوەندی بە دڵو دەرونو قەناعەتی ناوەوەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە لە هەموو قورئاندا ئایەتێك نیە باس لەوە بكات كە یەكێك لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە دەكوژرێت، بەڵكو تەنها باسی ئەوەیە لە قیامەتدا رووبەڕووی سزا دەبێتەوە.

**پرسیار :**

١. چۆن دەیسەلمێنیت كە ئیسلام بڕوای بە ئازادی ئاین و بیروڕا هەیە ؟

٢. بۆچی دەستدرێژی كردن بۆ سەر ئاینو بیروباوەڕو پەرستگەو مافەكانی شوێنكەوتووی ئاینەكانی دیكە قەدەغەیە ؟

## وانەی چواردەم

### ٥ - ئازادی بیر و بیروڕادەربڕین:

ئەم مافە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ بە ڕاشکاوی یاخود بە ئاماژە ئازاد بێت لە دەربڕینی ئەو بیرو باوەڕەی پێیەتی، جا بە زمان بێت یاخود بە نوسین یان بە هەر هۆیەکی دیکەی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە. ئیسلام لە ڕووی مێژوییەوە یەکێك لەو ئاینو شەریعەتانە بووە کە عەقڵو بیری مرۆڤی لە چەندەها کۆت و پێوەند و ترس ڕزگار کردووە، وە هانی داوە ئازادانە بیر لە نهێنیەکانی گەردوون و ژیانی خودی مرۆڤ بکاتەوە. هەروەها خودای گەورە ستایشی زۆری خاوەن هۆشەکان و ئەو کەسانە کردووە کە توانا ئەقڵیەکانی خۆیان بەکار دەهێنن و بە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باب و باپیران و یاخود خەڵکانی دیکە ڕازی نابن:((إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ))(**الجاثیة١٣**). :(( وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ)) (**آل عمران٧**).

ئەم ئایەتانە دەری دەبڕن کە خاوەن هۆشو گۆشەکانو ئەوانەی بیردەکەنەوە توانای تێگەیشتن لە نیشانەکانی خودای گەورەو ناوەڕۆکی پەیامی ئەویان هەیە.

مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئازادە لەوەی لە چ بوارێکدا دەنوسێتو لێکۆڵینەوە بکات بە ڕەچاو کردنی نیزامی گشتی کۆمەڵگا، نیشانەی ڕێزی ئیسلام بۆ بیر و باوەڕیش بە ئازادی بیری بە ڕوونی لە مافی کۆشش (اجتهاد) کردندا دەر دەکەوێت، زانایان مافی خۆیانە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیار و کێشە تازەکان بە پشت بەستن بە سەرچاوە ئیسلامیەکان هەوڵدان (اجتهاد) بکەن، واتە بیری خۆیان بخەنە گەڕ و ڕای خۆیان لەمەڕ ئەو بابەتانە و چۆنیەتی وەڵامدانەوە و چارەسەر کردنیان بخەنە ڕوو.

باوەڕبوون بە مافی(اجتهاد) یش باوەڕبوونە بە مافی جیاوازی بیری و ڕێز لێگرتنی چونکە زاناکان بیرکردنەوەیان وەکو یەك نیەو زۆر جار دەربارەی مەسەلەیەکی دیاریکراو چەندەها ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەبووەو هەیە.

مافی جیاواز بوونیش ئەوە دەخوازێت کە نە دەسەڵات و دەوڵەت نە کۆڕێکی زانایان ناتوانن خەڵکی ناچار بکەن شوێن ڕایەکی دیاریکراو بکەون و ڕاکانی دیکە قەدەغە بکەن.

ئیسلام پەیامێکی بیرمەندی خودایی ڕون و ئاشکراو بەهێزە هەرگیز لە ئازادی بیر و بیروباوەڕ نەترساوە چونکە لە دۆخی ئازادیدا بەهاکانی دەگەشێتەوە، ئیسلام کە مرۆڤی لە هەستیار ترین مەسەلەدا واتە مەسەلەی باوەڕ هێنانو هەڵبژاردنی ئاین ئازاد کردبێت و مافی جیاوازی ئاینیشی بۆ خاوەن ئاینەکانی دیکە مسۆگەر کردبێت، ڕوونە کە لە ئاستەکانی دیکەی وەك بیرو بیروڕای سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوری دا ئازادی ڕێبازو دروشمێتی، بۆیە هەموو هەوڵێکی بۆ سەپاندنی بیرێکی دیاریکراو یاخود ڕێگە گرتن لەوەی خەڵکی لە چوارچێوەی یاساو پاراستنی پێکەوەژیانی ئاشتیخوازانەدا گەر بەناوی ئیسلامیشەوە ئەنجام بدرێت، لە ناوەڕۆکدا دژی گیانی ئیسلامو بەها باڵاکانیەتی و پێی ڕازی نیە، ئەگەر

ئازادی بیر و بیروڕا لە رابردوودا گرنگ بوو بێت و ئیسلام بەو جۆرە سەیری کردبێت مێژووی ئیسلامی ئەو هەموو بیر و بیروڕا جیاوازانەی بەخۆیەوە بینیبێت، ئەوا بۆ ئەمڕۆ زۆر گرنگترە و خەڵکی بەرامبەر ئەم مەسەلە هەستیار ترن.

**پرسیار:**

١. بۆچی دەبێت ئازادی بیر و بیروڕا دەربڕین دەستەبەر بکرێت ؟

٢. ئایە ئیسلام قەدەغەی کردووە ئەقڵمان بەکار بێنین لە پێناو پێشخستنی شارستانیەتو داهێنانی نوێ؟

## وانەی پازدەم

### ٦ - مافی ئازادی کار کردن:

رونە کارکردن لە گرنگترین هۆیەکانی ژیانو بەرهەم هێنانە، ئاین و کلتورە جۆراوجۆرەکانو چاکسازان هانی مرۆڤ دەدەن بۆ کار کردن و دور کەوتنەوە لە تەمبەڵی و بێکاری. ئاینی ئیسلامیش بایەخێکی زۆر بە کارکردن دەدات.

چەندین فەرمودە هەن هانی کارکردنو سەرزەنشتی بێ کاری دەکەن:((أفضَلُ الکَسبِ بیعٌ مبرورٌ، وعمل الرجل بیدهِ)) واتە: باشترین کار کردن کڕینو فرۆشتن و کار کردنی مرۆڤە بە دەستو بازوی خۆی. ((انّ الله یحبُ المؤمن المحترفَ)) واتە: خودای گـەورە باوەڕداری خاوەن پیشـــەی خۆش دەوێت. ((انّ الله تعالی یحب اذا عمل احدکم عملاً ان یتقنه)). واتە: بەڕاستی خودای گەورە پێی خۆشە کاتێك یەکێکتان کارێکتان کرد بە وردی و دڵسۆزییەوە بیکات.

دیارە کار کردنو شۆڕشی پیشەسازی لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، بایەخێکی گەورەی پەیداکردووەو کرێکارانیش بوونەتە چینێکی گەورەو کاریگەری ناو سەندیکاو کۆمەڵگە کرێکاریەکانیش ڕۆڵێکی گەورە لە ژیانی پیشەییو هەندێك جار سیاسیش دەبینێت.

مەبەست لە مافی کار کردنیش ئەوەیە کە مرۆڤ ئەو مافەی بەسەر دەوڵەتو کۆمەڵگەوە هەیە کە بێکار نەبێت و دەرفەتی کاری بۆ پەیدا بکرێتو رێ لە کار کردنی نەگیرێت .

ئازادی کارکردنیش بریتییە لەوەی تاك مافی ئەوەی هەیە کارێك بکات یاخود وازی لێ بێنێتو جۆری کاری دڵخوازی خۆی هەڵبژێرێتو بە زۆر کارێکی دیاریکراوی لێ قەدەغە نەکرێتو یەکێکی دیکەی بە زۆر بەسەردا نەسەپێنرێت، کە لە هەندێك قۆناغی مێژووشدا بەم جۆرە بووە.

هەوڵدەدەین هەرچی پەیوەندی بەم مافەوە هەیە بەم جۆرەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

### ١ - هاندانی ئیسلام بۆ کارکردن:

ئیسلام هانمان دەدات کارکردنمان خۆش بوێتو ببێت بە بەشێك لە ژیانمانو تەمبەڵی و بێکاریش واز لێ بێنین پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت:((من أمسی کالاً من عملِ یَدِه أمسی مغفوراً لهُ)). واتە: هەرکەسێ نانی ڕەنجی شانی خۆی بخواو ڕۆژ بە کارکردنەوە بەسەر بەرێت خودا لێی خۆش دەبێت.

ئەم فەرمودەیە بەهای کارکردن هێندە بەرز و پیرۆز دەکات، کە خودا بەو گەورەییەی خۆیەوە پاداشتی مرۆڤ دەداتەوە لە سەریو کە ئەویش لێخۆشبوونە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کارکردنی حەڵاڵو بێ فروفێڵ بە ئەنجامدانی کردەوەی چاك دەژمێردرێت.

هەروەها پێغەمبەر(دخ) هەڕەشە لە بێ ئیشی و رازی بوون بە ژیانی کولەمەرگی دەکاتو دەفەرموێت: ((اشدُّ الناس عذاباً یوم القیامةِ الکفي الفارغ)) واتە: ئەوانەی پاڵیان داوەتەوە و کار ناکەن و بە ژیانێکی کولەمەرگی پڕ لە کوێرەوەری رازین، خودا سەختترین سزایان دەدات. چونکە ئیسلام نایەوێت مرۆڤ مشەخۆر بێت بەسەر کەسانی دیکەوە، بەڵکو دەبێت ئەندامێکی چالاکی

کۆمەڵگە بێتو کار بکات و بەسەر بەرزی بژیت و بەهێز بێت: ((المؤمن القوي خيرٌ وأحبُّ الى الله من المؤمن الضعيفِ)) واتە: پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت: باوەڕداری بەهێز لە باوەڕداری بی هێزو لاواز باشترو خۆشەویسترە لە لای خودا. بۆیە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە لە بەر تیشکی هەقو دادپەروەریدا بەدوای سەرچاوەکانی هێزدا بگەڕێین و لەم پێناوەشدا کارو چالاکیمان خۆش بوێت.

**٢ - مافی مرۆڤ لەوەی دەرفەتی کاری بۆ دابین بکرێت:**

ئیسلام بە ئەرکی دەوڵەتی دەزانێت دەرفەتی کار بۆ هاولاتیان بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی توانا جۆراوجۆرەکانیان بخەنە گەڕو سەرچاوەیەکی ژیانی ئابڕومەندانە بۆ خۆیان بەدەست بهێننو تواناکانیان نەپوکێتەوە و نەبن بە بار بەسەر کۆمەڵگەوە.

**٣ - مافی کرێکار لە وەرگرتنی کرێکەی لە کاتی خۆیدا و بێ دواکەوتن:**

ئیسلام لەسەر خاوەن کاری پێویست کردووە پێش دەست بە کاربوون کرێی کرێکار دیاری بکاتو دوای تەواوبوونی کارەکەشی یاخود لەو کاتانەی لەسەری رێك کەوتوون بێ دواکەوتن کرێکەی بدات، لە پێغەمبەر(دخ) دەگێڕنەوە: **نهى رسول الله ( ﷺ ) عن استئجار الأجير حتى يبين له أجره،** واتە: پێغەمبەر(دخ) فەرمانی کردووە پێش بەکرێگرتنی کرێکار کرێکەی دیاری بکرێت. بۆ ئەوەی ستەمیان لێ نەکرێت و پێگەی کۆمەلایەتییان خراپ بەکار نەهێنرێت.

هەروەها پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت: ((اعطوا الاجير اجره قبل ان يجفَّ عرقه)) واتە: پێش ئەوەی ئارەقی کرێکار وشك بێتەوە کرێکەی بدەنێ، چونکە بەشێك لە کرێکاران لەبەر سنورداری داهاتیان لەسەر ئەو پارەیە دەژین کە رۆژانە لە بازاڕی کاردا دەستیان دەکەوێت.

هەندێك لە زانایانی شەرع ناسیش رایان وایە ئەگەر خاوەن کارێك پارەی کرێکارەکانی نەدات ئەوا ئەو شتەی ئەو کارەیان تێداکردووە (ضامن) ی پارەکەیانەو دەتوانێت پۆلیس بێ گەڕانەوە بۆ دادگا بیفرۆشێتو پارەکەیانی لێ بدات، لە هەموو حاڵەتێکیشدا دادگا رێگە نادات مافی هیچ کرێکارێك بخورێتو لە حاڵەتی بوونی سکالای یاساییش لەسەر نەدانی کرێ دەبێت باج و پارەی پارێزەر و هەر ئەرکێکی دیکە بکەوێتە ئەستۆی خاوەن کار.

**٤ - دابین کردنی مووچەی فەرمانبەرانو کرێی کرێکاران بە جۆرێك پێداویستیەکانی ژیانێکی مام ناوەندییان بۆ دابین بکات:**

دادپەروەری کە بەهایەکی مەزنی ئیسلامە ئەوە دەخوازێت کە کرێی هەر مرۆڤێك لەگەڵ گرنگی کارەکەی گونجاو بێتو لانی کەم ژیانێکی ئابڕومەندانەی هەبێت. چونکە کرێی کەم لای هەندێك کەس دەبێتە سەرچاوەی بەرتیلو دزی لە ماڵی گشتی کە ئەوانەش تاوانو یاسا سزایان لە سەر دەدات.

لانی کەمی کرێش لە ئیسلامدا بریتییە لەوەی پێداویستیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ پڕبکاتەوە، هەموو کرێکارو فەرمانبەرو مرۆڤێك لە روانگەی ئیسلامەوە مافی خۆیەتی ماڵو هاوسەرو هۆی هاتوچۆو سەرچاوەی ژیانی رۆژانەی هەبێت.

هەروەك لە فەرمودەیەكدا هاتووە پێغەمبەر (دخ) دەفەرمویێت:((مَنْ ولي من امرنا، وليس له منزلٌ فليتخذنَّ منزلاً، او ليس له زوجة فليتزوج، او ليس له خادم فليتخذ خادماً، او ليس له دابة فليتخذ دابّة، فمن اتخذ سوى ذلك، جاء يوم القيامة غالاً مسرفاً)) واتە: هەركەسێك كارێكمان بۆ بگرێتە دەستو خانووی نەبوو، با خانوویەكی بۆ دابین بكرێت، وە ئەگەر هاوسەری نەبوو با هاوسەر پەیدا بكات، وە ئەگەر هۆكاری هاتووچۆی نیە، با دابینی بكات، هەر كەسێك لەوە زیاتر پەل بهاوێت لە رۆژی قیامەتدا بە خیانەتكار و دەست بڵاو دەژمێردرێت.

ئەبی عوبەیدەش كە هاوەڵی پێغەمبەر بوو(دخ) ئامۆژگاری پێشەوا عومەر دەكاتو دەڵێت:((اذا استعملتم فاجزل لهم العطاء فلا يحتاجون)) واتە: ئەو كەسانەی لە راپەڕاندنی ئیشو كارەكانتاندا بەكاریان دەهێنن ئەوەندەیان بدەنێ پێویستیەكانیان پڕ بێتەوە و دەست كورت نەمێنن.

### ٥ - قەرزدان بە كرێكاران و بەخشین پێیان:

شێوازێكی دیكەی ئیسلام بۆ بەكار خستنی دەستی كارو زیادكردنی دەرفەتی كار بریتییە لە كڕینی ئامێری كاركردن بۆ ئەو پیشەوەرو شارەزایانەی كە لە پیشەیەكی دیاریكراودا شارەزان بەڵام توانای دابین كردنی ئەو ئامێرانەیان نیە كە بۆ كارەكانیان پێویستن، پێشەوا غەزالی پێی وایە ئەركی حكومەتە پێداویستیەكان بۆ ئەو كەسانە دابین بكات وە یارمەتی گشتیاران و خاوەن كارەكان بداتو پشتیان بگرێت، حكومەتە خزمەتگوزارەكانی ئەمڕۆش زۆربەیان ئەم ئەركە ئەنجام دەدەن.

پێشەوا غەزالی لەم رایەیدا پشتی بەستوە بە فەرمودەیەكی پێغەمبەر(دخ) كە رۆژێك پیاوێك هاتە لایو سكاڵای هەژاری خۆی لا كرد ئەویش دوو درهەمی دایێ و پێی فەرموو: ((كُل باحدهما، واشترِ بالآخرِ فأساً فاعمَلْ بِها)). واتە: بە درهەمێكیان خواردن بكڕەو بە درهەمەكەی دیكە تەورێك بكڕەو كاسبی بكە.

زانایەكی گەورەی موسوڵمانیش بەناوی (ئەبو یوسف) كە هاوەڵی پێشەوا (ئەبی حەنیفە) بووە دەڵێت(( ئەگەر خاوەن زەوییەك لەبەر هەژاری نەیتوانی زەوییەكە بكات بە كشتوكاڵ، دەبێت ( بيت المال) یاخود لەم رۆژەدا بانكێكی پسپۆڕی وەك بانكی كشتوكاڵی ئەوەندە یارمەتی بدات كە توانای بەگەڕ خستنی زەوییە كەی و ئیش كردنی تیایدا هەبێت)).

ئەویش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەركی دەوڵەتە یارمەتی جوتیار و خاوەن پیشەكان بدات بە قەرز یاخود بە یارمەتی بۆ ئەوەی بتوانن پێویستیەكانی كارەكەیان دابین بكەن و بێكار نەمێننەوە.

### ٦ - مافی بێكارانە تا كارێكیان دەست دەكەوێت بیمەی كۆمەڵایەتیان پێ بدرێت:

حاڵەتی ئاسایی ئەوەیە مرۆڤ بە كارو ماندوبوونی خۆی بژی، ئەگەر كاریشی دەست نەكەوت دەبێت دەوڵەت هەوڵبدات دەرفەتی كاری بۆ بدۆزێتەوە، هەڵبەت -وەك لە وڵاتی ئێمەدا باوە- مەرج نیە بە دامەزراندن بێت لە دامو دەزگا حكومیەكاندا، خۆ ئەگەر دەوڵەتیش توانای فەراهەم كردنی دەرفەتی

کاری نەبوو ئەوا دەوڵەت و کۆمەڵگەو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان ئەرکیانە لە ماوەی بێ کاری هەر هاوڵاتیی و مرۆڤێکدا بیمەی کۆمەڵایەتی بدەنێ و لانی کەمی ژیانی بۆ دابین بکەن، چونکە هەموو کەس مافی ژیان و پاراستنی کەرامەتی هەیەو سواڵ و دەست پان کردنەوەش لە ئیسلامدا حەرامەو نابێت ڕێگەی پێ بدرێت.

(ئیبن عابدین) زانا و شەرع ناس لەم رووەوە دەڵێت:((للقاضي ان يلزم ولي الأمر بالانفاق على الفقير العاجز)). واتە: دادگا بۆی هەیە دەوڵەت ناچار بکات بە ژیانی هەژارە بێ تواناکان، واتە ئەوانەی هەژارن و لە بەر هەر هۆیەك توانای کار کردنیان نیە.

زانای ناودار (ئیبن تەیمیە) ش دەڵێت:((ئەگەر زەکات پێویستی هەژارانی پڕ نەکردەوە ئەوا ئەرکی دەوڵەتە ئەو پێویستیانەیان بۆ پڕ بکاتەوە، خۆ ئەگەر کاربەدەستانی دەوڵەت ئەمەیان نەکرد خاوەن پێویستیەکان مافی خۆیانە سکاڵا لەبەردەم دادگا لەسەر دەوڵەت و کاربەدەستان تۆمار بکەن)).

### ٧ - گوزەران بژێوی ژیان مافی هەموو مرۆڤێکە :

ئیسلام لەگەڵ ئەوەدایە کە دەوڵەت ژیانێکی ئابڕومەندانە بۆ هاوڵاتیان بێ جیاوازی دابین بکات، پێغەمبەر(دخ)و پێشەوا ئەبوبەکری صدیق(رخ) بە یەکسانی ئەو داهاتەی دەوڵەت هەیبوو بەسەر دانیشتوانەکەیدا دابەشیان دەکرد، چونکە هەروەك عومەری کوڕی خەتتاب(دخ) لە وتەیەکدا دەری بڕیوە داهاتی گشتی مافی هەمووانی پێوەیە:((واللهِ الذي لا اله الا هوَ ما احدٌ الا وله في هذا المالِ حقٌّ، وما أحدٌ أحقُّ بهِ منْ أحدٍ، وما أنا فيه الا كأَحدِهم)) واتە: سوێند بە خودای تاك و تەنها هەموو کەسێك بەشی لەمماڵەدا هەیە ( ماڵی دەوڵەت ) کەسیش شایستەتر نیە بە ماف لەوی دیکە، منیش لەو نێوەندەدا وەك هەر یەکێکم لە خەڵکە کە، لە سەردەمی جێنشینەکانی راشدیندا جگە لەوەی گەورەکان بەشیان هەبووە، منداڵێك کە لە دایك بووە یەکسەر لە (بيتُ المال) بەشی یاخود مووچەی خۆی بۆ دیاری کراوە.

### ٨ - مافی خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکان لە کەفالەت کردن :

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد مرۆڤ دەبێت خۆی کار بکات و بە هۆیەوە ژیان و گوزەرانی دابین بکات، وە ئەگەر کاری دەست نەکەوت ئەرکی دەوڵەتە پێویستیەکانی کارکردن یاخود دەرفەتی کاری بۆ دابین بکات، ئەگەر ئەوەش نەکرا دەبێت دەوڵەت تا کاری دەست دەکەوێت خۆی و خێزانەکەی بژیەنێت و، ئەوەی ئێستا پێی دەوترێت بیمەی کۆمەڵایەتی (الضمان الاجتماعي) پێ بدرێت، ئێستا قسە لەسەر ئەوەیە ئەگەر دەوڵەت توانای ئەوەی نەبوو بێ کارو ئەو مرۆڤانەی توانای کار کردنیان نیە بژیەنێت دەبێت چ بکرێت؟ زانا موسوڵمانەکان هەر لە کۆنەوە ئەویان رونکردۆتەوە کە لەکاتی بێ توانایی دەوڵەت لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەدا لێپرسراوێتی روو دەکاتە دامو دەزگاکانی کۆمەڵگەو لەوانەش توێژە دەوڵەمەندەکەی کۆمەڵ.

زانایان لەم ڕووەوە فەرموویانە: ئەگەر زەکاتو بانکی مەرکەزی توانای دابین کردنی پێویستیەکانی هەژارو خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکانی کۆمەڵگەیان نەما ئەوا دەبێت دەوڵەمەندەکانو ڕێکخراوەکان پێویستییە بنەڕەتیەکانیان بۆ دابین بکەن، لە شوێنی حەوانەوەو خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو چاودێری تەندروستی.

پوختەی قسە لەم ڕووەوە ئەوەیە کە ئیسلام کارکردن بە بەهایەکی بەرزی خۆی دادەنێت و هانی کارکردن دەدات، مرۆڤ مافی کارکردنی هەیەو ئەرکیشیەتی کار بکاتو توانا خواپێداوەکانی بخاتە گەڕ بۆ کەسیش نیە بە زۆر کارێکی بەسەردا بسەپێنێت چونکە کاری زۆرەملی و سوخرەش لە ئیسلامدا قەدەغەو حەرامە. لەلایەکی تریشەوە دەبێت مافەکانی کرێکاران بە جوانی بپارێزرێت هەر بۆیە ڕۆحی ئیسلامو ڕێنوێنیەکانی لەم سەردەمەدا لەگەڵ یاسایەکی کاری دادپەروەرانەو دابین کردنی کار و بیمەی کۆمەڵایەتیو چاودێری تەندروستیو دابین کردنی ژیانێکی ئابڕومەندانەو خۆشگوزەران بۆ کرێکارانو سەرجەم موچەخۆران دایە.

**پرسیار :**

١. ئایە مافی کارکردن لە ئیسلامدا تەنها پەیوەندی بە بوونی ئیشەوە هەیە بۆ مرۆڤ ؟

٢. لێپرسراوێتی کۆمەڵگە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ نەهێشتنی هەژاری و بێکاری چییە ؟

**گفتوگۆ :**

هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی ئازادیو مافی کارکردن پەیوەندی لەگەڵ بیمەی کۆمەڵایەتی (**الضمان الاجتماعي**) لە سەردەمە نوێکاندا چییە ؟

## وانەی شازدەم

### ٧ - مافی چارەی خۆنووسین

گەر کەرامەتی مرۆڤایەتی پایەو بناغەی مافی تاکەکان بێت، ئەوا هەر ئەویش بەردی بناغەی مافو ئازادی گەلانە، چونکە ئەندامانی گەلێکی ژێردەستەو بێ ماف ناتوانن هەست بە پاراستنی کەرامەتو سەربەرزی خۆیان وەك مرۆڤ بکەن، بۆیە مافی گەلو میللەتان لە دیاریکردنی مافی چارەنووسی خۆیانداو یەکسان بوونیان لەگەڵ یەکداو مامەڵەیەکی مرۆڤانە بەشێکە لە مافەکانی مرۆڤو پاراستنی کەرامەتی لە بریندار کردن وسوکایەتی پێ کردن.

بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش دانی بەم مافەدا ناوە، وە ئاماژەی بەوە کردووە کە یەکێك لە مەبەستەکانی ئەو نەتەوانەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووە کانیان پێك هێناوە، بریتییە لە پەرەپێدانی پەیوەندی دۆستانەی نێوانیان (لەسەر بناغەی ئەو بنەمایەی کە مافی یەکسانی بە تەواوی گەلان دەدات وە هەر یەکەشیان مافی چارەنووسی هەبێت) .

ماددەی یەکەمی هەردوو پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنیو سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو کلتوریەکانیش ئەم مافەی رونکردۆتەوەو دەڵێت:((هەموو گەلێك مافی چارەی خۆنوسینی هەیە، بە گوێرەی ناوەڕۆکی ئەم مافەش مافی دیاریکردنی پێگەی سیاسیو ئازادی مسۆگەری پەرەپێدانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری هەیە)).

مافی چارەی خۆنوسینیش بریتییە لەوەی گەلو نەتەوەیەك بە ئیرادەی ئازادی خۆیو دور لە هەر زۆر لێکردنێك رێو جێی سیاسیو پەیوەندی بە گەلو نەتەوەکانی دیکەو سیستمی فەرمانڕەوایی خۆی دیاری بکات.

مافی چارەی خۆنوسینیش دەکرێت بە سێ بەشەوە:

١ . یەکگرتنی ئارەزوومەندانە (فیدراڵیەت).

٢ . چونەپاڵ دەوڵەتێکی دیکە (دووبەشی نەتەوەیەك یەك بگرنەوە).

٣ . دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی.

ئێستا با بزانین بۆچوونی ئیسلامی دەربارەی مافی چارەنووسی گەلان چییە و چۆن تێی بگەین؟!.

## ئیسلام و مافی چارەی خۆنووسینی گەلان

روونە کە لە کاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا باسێك لەم زاراوەو مافە لەسەر زەویدا نەبووە، چونکە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان دوای سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی لە دوای شۆڕشی فەرەنسا لە ئەوروپا و، رونتریش لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا هاتۆتە کایەوە، بەڵام ئەمە مـــانای ئەوە نیە کە ئێمە توانای ئەوەمان نیە لە روانگەی بەها باڵاکان و بنەمـــا گشتییەکانی ئیسلامەوە لەم مافە تێبگەین.

ئەگەر ئێمە سەیری قورئانی پیرۆز بکەین هەروەك لە باسەکانی پێشووتریشدا ئاماژەمان پێکرد، تێدەگەین کە مرۆڤ لە زەویدا سەرداری خۆیەتیو ئازادی خۆی بە دەستی خۆیەوەیەتی. ئەم سەرداریو سەروەرییەی مرۆڤیش لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە خودای گەورە کردویەتی بە جێنشینی خۆی لەسەر زەویدا و ئیرادە و توانای هەڵبژاردنی پێ بەخشیوە:(( وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ... ))(البقرة٣٠) واتە: ئێمە مرۆڤمان کردووە بە جێنشین لە زەویدا.

خودای گەورە ئەو مافەی بە مرۆڤ بەخشیوە کە چارەنووسی خۆی بەرامبەر بە خۆیو کەسانی دیکەو خودای گەورەش دیاری بکات، هەروەك لە قورئاندا دەفەرموێت:((إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا)) (الانسان٣) واتە: ئێمە رێگامان نیشانی مرۆڤ داوە ئەویش بە ئیرادەی ئازادی خۆی رێبازی باوەڕو سوپاسگوزاری پەروەردگار یاخود بێ باوەڕیو ناسوپاسگوزاری دەگرێتە پێشو هەڵدەبژێرێت.

ئەم مافی هەڵبژاردنو دیاریکردنی چارەنووسەش، هەروەك چۆن مافی مرۆڤێکە، ئا وەهاش مافی گروپو گەلو نەتەوەیەکە، چونکە خودای گەورە ئازادی بە جۆری مرۆڤ بەخشیوە وەك مرۆڤ و گەلو نەتەوەکانیش پێکهاتەی خێزان و تاکەکان و ئەندامانی نەتەوەن.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە: کە ئەگەر خودای گەورە لە ناسکترین شتو یەکێك لە گرنگترین چەســپاو (ثوابت) ەکانی ئاین کە باوەڕە ئەو ئازادییەی بە مرۆڤ دابێت کە باوەڕ بێنێت یاخــود نەیهێنێت وە بۆ کەســیش نەبێت زۆری لێ بکات، چونکە زۆرکردن لە ئایندا قەدەغەیە: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ...) (البقرة٢٥٦).

داخۆ بۆ مەسەلەیەکی سیاسی وەك ژیان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی دیاریکراو سیستمی سیاسیو فەرمانڕەوایی کە یەکێکە لە مەسەلە گۆڕاوەکان (المتغیرات) و بەجێ هێڵراوە بۆ ئالْو گۆڕو پێشکەوتنەکانی مرۆڤ لە چوارچێوەی بەهاکانی دادپەروەری و راوێژ و ئازادیو یەکسانیدان چۆن دەبێت زۆر لە گەلان بکات کە بە زۆر و بێ خواستی خۆیان لە ناو قەوارەیەکی سیاسیدا بژین ؟

روونە کە ئیسلام لەم مەسەلانەدا رێزی لەو ئیرادەیە گرتووە کە خودا بە مرۆڤەکانی بەخشیوە، ئەوەی بەلای خودای گەورەشەوە گرنگە، ئەوە نیە گەلان خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان بن یاخود بە ئیرادەی ئازادی خۆیان بڕیاری پێکەوەژیان بدەن لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵیدا بەڵکو گرنگ رەچاوکردنی بەها ئیسلامیەکانی وەکو دادپەروەریو کەرامەتپارێزیو ستەم دژیو راوێژ و ئازادی و یەکسانیە، لە روانگەی ئیسلامەوە رەوایەتی فەرمانڕەوایی و فەرمانڕەواکان لە رێگەی وتن (عقد) ێکی نێوان گەلو هاوڵاتیانو لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت،وە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەو بۆ کەس نیە لە دەرەوەی ئیرادەو رەزامەندی گەلو هاوڵاتیانەوە خۆیان بەسەردا بسەپێنێت، کەواتە پێش هەموو شتێك دەبێت راپرسی لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا بکرێت بە تایبەتیش ئەوانەی کە تا ئێستا خاوەنی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەیی خۆیان نین، کە داخۆ دەیانەوێت لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتانەی ئێستادا بمێننەوە یاخود دەخوازن جیا ببنەوە وقەوارەی سەربەخۆی خۆیان پێك بهێنن، بەدەر لەمە

پەنابردنە بەر هێز بۆ سەرکوتکردنی نەتەوەیەك وە بە زۆر هێشتنەوەی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکداو بێ بەشکردنی لە مافی چارەی خۆنووسین دژی گیانی ئیسلام و بەها باڵاکانیو لەوانەش بەهای ستەم دژی واتە دژایەتیو رەت کردنەوەی ستەم.

چونکە ئیسلام دژی ستەمو ستەمکار ییە و لە هەر بەرگێکدا، بێ بەشکردنی گەلانیش لە مافی چارەی خۆنووسینو رێز نەگرتن لە ئیرادەی خواپێداویان جۆرەها ستەم و خراپەکاری لێدەکەوێتەوە، بەم جۆرە و لە روانگەی بنەما و بەها ئیسلامیەکانەوە تێدەگەین کە بۆچوونی ئیسلام لەم رووەوە لەگەڵ مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان و یەکسانی گەلاندایە.

**پرسیار** :

١. چۆن ناوەڕۆکی مافی چارەی خۆنووسین لە روانگەی ئیسلامەوە تیٚ بگەین ؟

٢. لەسەر چ بناغەیەك لە ئیسلامدا مافی چارەی خۆنووسین کراوە بە مافی نەتەوەکان ؟

**گفتوگۆ** :

پەیوەندی مافی چارەی خۆنووسین بە هەردوو چەمکی (برایەتی) و(یەکسانی) لە ئیسلامدا



# وانەی حەڤدەم

## بەها ئیسلامییەکان

**یەکەم - گفتوگۆ:**

گفتوگۆ بەهایەکی ئیسلامیو ئینسانیە، بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت مامەڵەیەکی راستو دروست لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا بکاتو، نەتەوە و کۆمەڵگاکانیش بەرەو لوتکەی پێشکەوتن و تەواوی دەبات.

## بایەخی گفتوگۆ لە ئیسلامدا

گفتوگۆ رێبازی سەرجەم پێغەمبەرانی خودا بووە (سلاویان لێ بێت) کاتێك نەتەوەکانیان بۆ خێرو چاکەو خوداپەرستی بانگ کردووە، لە ئیسلامیشدا گفتوگۆ بایەخێکی زۆری پێ دراوەو یەکێك لە پایەکانی ئەم ئاینە خودایییەیە.

خودای پەروەردگار گفتوگۆی لەگەڵ فریشتەکان کردووە، وەلەگەڵ ئادەمدا کاتێك سەرپێچی کرد، وە لەگەڵ شەیتاندا کاتێك یاخی بوو، وە لەگەڵ خودانەناسو بێ باوەڕەکاندا پێش ئەوەی سزایان بەسەردا ببارێنێت، رێبازی پێغەمبەری خوداش (دخ) بووە بۆ گەیاندنی پەیامەکەی و مامەڵەکردن لەگەڵ شوێنکەوتەی ئاینەکانی دیکەو دەوروبەرەکەیدا، چونکە ئیسلام هەرگیز لە گفتوگۆی ئازادو ئازادی رادەربڕین نەترساوەو هێندە بەهێزبووە کە هەمیشە لەو کەشو هەوایانەدا پێگەی زیاتر بەدەستبخاتو دڵانێکی زۆرتر بۆ لای خۆی کەمەنکێش بکات.

## بایەخی گفتوگۆ لە ژیاندا

گفتوگۆ بایەخێکی یەکجار گەورەی لە ژیانی نەتەوەو کۆمەڵگەکاندا هەیە کە لێرەدا تەنها ئاماژە بە دوو بایەخ دەکەین:

١ – گفتوگۆی هێمنانە و جدی رۆڵێکی گەورەی لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا هەیە ئەویش لە رێی کەم کردنەوەی جیاوازی و ناکۆکیەکان و کۆکردنەوەی دڵەکانو فراوانکردنی بازنەی رێکەوتن لە نێوان لایەنە جیاواز و ناکۆکەکاندا.

٢ – پتەو کردنی کاری هاوبەشو قوڵکردنەوەی بەیەکەوە ژیانو لێبوردەیی لە نێوان ئاینو گەلو نەتەوەکاندا، لە پێناو بیناکردنی ئایندەیەکی هاوبەشی روناکدا بۆ هەمووان.

**گفتوگۆ چییە ؟**

گفتوگۆ بریتییە لە گۆڕینەوەو پێداچوونەنوەی قسەکردن لەنێوان دوو لایەندا بە مەبەستی گەیشتن بە کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش لە کەشو هەوایەکدا کە هێمنیو هاوسەنگی بەسەردا زاڵ بێتو باڵی بەسەردا بکێشێت.

**گفتوگۆ و پەیوەندی بە جیاوازییەوە:**

جیاوازی لە ناو گۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا یەکێکە لە یاساکانی خودای گەورە لەم ژینەدا، چونکە ئەستەمە خەڵکی لەسەر یەك شێوە ژیان و بیرکردنەوە کۆ ببنەوە، لەبەر ئەوە تا ئەو رۆژەی ژیان لەسەر ئەم زەویەدا بمێنێت جیاوازیش هەر دەمێنێت. قورئانیش لەم بارەیەوە دەفەرموێت:(( وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ )) (هود١١٨). واتە: (ئەی محمد) ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە، سەرجەم خەڵکی دەکرد بە نەتەوەیەك و لەسەر رێچکەو رێبازێك کۆی دەکردنەوە بەڵام ئەوان (واتە خەڵکی ئێستاکەشی لەگەڵدا بێت) هەر جیاوازن، پێشەوا رازی دەڵێت:((مەبەست لە جیاوازی خەڵکە لە ئاینو رەوشتو کارو کردەوەدا)).

دیارە لەگەڵ بڕوابوون بە گفتوگۆ، جیاوازیو فرەیی ئاینیو نەتەوەیو سیاسیو ئابووریو فەرهەنگی، نەك هەر نابێتە سەرچاوەی خراپە، بەڵکو دەبێتە هۆکارێکی گرنگی دەوڵەمەند بوونی شارستانییەتییەکانو جوانتر کردنی ژیان.

## گفتوگۆ لە قورئاندا

قورئانی پیرۆز هانی باوەڕداران دەدات بۆ ئەوەی لە گەیاندنی پەیامەکەیاندا پشت بە گفتوگۆو قەناعەت پێکردن ببەستنو، لێی قەدەغە کردون بە زۆر بیروباوەڕ بەسەر کەسانی دیکەدا بسەپێنن. لەم روەشەوە چەندین نموونەی گفتوگۆ لەگەڵ جیاوازو نەیارەکان خستۆتە بەردەممان، بۆ ئەوەی باوەڕداران بە سود وەرگرتن لەم نموونانە، ئەوانیش بتوانن کێشەکانیان لە ناوخۆ و دەرەوەدا بە گفتوگۆ چارەسەر بکەن و تا ئەو پەڕی کە دەکرێت پەنا نەبەنە بەر هۆیەکی دیکە، دیارە خودای گەورە خاوەن دەسەڵاتێکی بێ سنورە و زۆر بە ئاسانی دەیتوانی ئەوانەی دژی دەوەستنەوە و نەیاری لەگەڵدا دەکەن نەك هەر بێ دەنگ بکات، بەڵکو لەناویان بەرێتو لە بووندا بیانسرێتەوە، بەڵام خودای گەورە ئەو کارە ناکاتو بەمەش دەیەوێت ئەوەمان تێ بگەیەنێت کە رێگەی سروشتی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانو مامەڵە کردن لەگەڵ ئەوانەی کە لە ئێمە جیاوازن، جا ئایە جیاوازی ئاینی بێت یاخود نەتەوەیی و سیاسی و هەر شتێکی دیکە ، بریتییە لە گفتوگۆ و پێکهاتن.

بایەخدانی قورئان بە گفتوگۆ (حوار) لە ئاستێکدایە کە (١٧٠٠) جار بە شێوەو داڕشتەی جۆراوجۆر ئاماژەی پێ کردووە.

قورئان چیرۆكو داستانی چەندین پێغەمبەری خودامان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن ویستویانە لە رێی گفتوگۆ و شێوازی جوان دواندنەوە نەتەوەکانی خۆیان قەناعەت پێ بکەن و پەیامی خودایان پێ بگەیەنن .

هەروەها قورئان بانگی شوێنکەوتەی ئاینە ئاسمانیەکانی دیکە دەکات بۆ کۆبوونەوە لەسەر کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش کە لە بنەڕەتدا هەموو ئاینەکان تیایدا هاوبەشن:(( قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ

سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ)) (آل عمران٦٤) واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن بۆ ڕێککەوتن لەسەر وتەو مەسەلەگەلێکی هاوبەش لە نێوانماندا کە بۆ هەردوکمان وەك یەك وابێت کە ئەوانیش بریتین لە: هیچ شتێك نەکەین بە هاوبەشی خودا، جگە لە خودا کەسمان ئەوی دیکەمان نەکات بە خوداوەندو دەسەڵاتێکی نیمچە ڕەهای پێ بدەین‌و بە ئارەزوی خۆی چی دەوێت بیکات‌و ئێمەش ملکەچ بکات.

## پێویستیەکانی گفتوگۆیەکی سەرکەوتوو

بۆ ئەوەی گفتوگۆ سەرکەوتوو بێت دەبێت لایەنەکان ڕەچاوی چەند بنەمایەك بکەن لەوانەش:

١ – قسە کردنی زانستی‌و بابەتی:

لایەنەکان پێش ئەوەی بچنە ناو گفتوگۆوە دەبێت لەم ڕووەوە جوان خۆیان ئامادە کردبێت‌و لایەنەکانی بابەتی گفتوگۆ لەسەر کراوو ئامانجەکانیان لا روون بێت وە لایەنی بەرامبەریش جوان بناسن، قورئان لەم ڕووەوە دەفەرموێت:(( قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ))(البقرة١١١). واتە: گەر لە داواکەتاندا ڕاست دەکەن بەڵگە لەسەر ڕاستی قسە و بۆچوونەکانتان بهێننەوە، هەروەها قورئان دەفەرموێت:(( وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً )) (الاسراء٣٦)

واتە: هەڵوێستە لە مەڕ شتێك مەکەو باوەڕی پێ مەکەو پشتی پێ مەبەستە کە زانیاریت پێی نیەو جوان دەرکت نەکردووە و نازانیت حەقیقەتەکەی چییە.

٢ – پەی بردن بەوەی کە جیاوازی یاسایەکی گەردونیە :

وەك باسکرا خودای گەورە مرۆڤەکانی بە ڕەنگ‌و زمان‌و نەتەوەو ئەقڵی جیاوازەوە بەدیهێناوە هەموو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە فرەیی (التعددية) حاڵەتی سروشتی ژیان‌و بونەوەرەو دەبێت ڕێزی لێ بگیرێت‌و هەرکەسێك بە زۆر هەوڵی سڕینەوەی جیاوازیەکان بدات دژی ئیرادەی خودای گەورە دەوەستێتەوە، چونکە ویستی خودا وایە ئەو جیاوازیانە هەبن:((وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ)) (الروم٢٢)، واتە: یەکێك لە نیشانەکانی خودای گەورە بریتییە لە بەدیهێنانی ئاسمان‌و زەوی‌و جیاوازی ڕەنگ‌و زمانتان ئەوەش بەڵگەو نیشانە گەلێکن بۆ زانایان. دەبێت لایەنەکانی هەر گفتوگۆیەك لە داننان بەم جیاوازیانەو جیاوازی نێوانیانەوە دەست پێبکەن‌و هەر لەوێشەوە بە دوای ڕێککەوتن لەسەر کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش بگەڕێن.

٣ – زۆر لێنەکردن:

یەکێك لە مەرجە بنەڕەتیەکانی گفتوگۆ ئازادی لایەنەکانە لە دەربڕینی بیروڕا و بۆچوونی خۆیان‌و ئەو شتانەی کە لەسەری ڕێك دەکەون، بۆلایەنێك نیە زۆر لەلایەنەکەی دیکە یاخود لایەنەکانی دیکەی

گفتوگۆ بکات یاخود بترسێنێت: ((لآ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ...))(البقرة٢٥٦).هەروەها دەفەرموێت:((... وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ)) (ق٤٥).

واتە: ئەی محمد تۆ زۆردار نی بەسەر ئەو خەڵکەوە تا شتێك خۆیان رازی نەبن پێی بەزۆر پێیان بکەی، ئەتۆ بە قورئان راستییەکان بیری ئەو کەسانە بێنەرەوە کە لە هەڕەشەی خودایی و رۆژی دوایی دەترسن.

دیارە ئەگەر خودا مافی زۆرلێکردن لە خەڵکی بۆ وەرگرتنی ئاینی خۆی رەتکردبێتەوە، ئەوا بۆ هیچ هێز ولایەنێکی دیکە نیە بە زۆر ئیرادەی خۆی بەسەر ئەوانی دیکە دا بسەپێنێت.

٤ – گرنگی دان بە خاڵە هاوبەشەکان و بە یەکدی گەیشتن :

گومانی تێدا نیە کە لایەنەکان کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشیان لە نێواندایە . ئەو جیاوازیانە هێندە گەورە نەبن ببنە ناکۆکی و کێشەیان لێ بکەوێتەوە و نەتوانن بەیەکەوە بژین، دەربارەی گیانی گفتوگۆو رێزگرتن لە رای بەرامبەر ئیمامی شافعی لە وتەیەکدا دەڵێت : (( رای من راستە و گریمانەی هەڵەبوونیش هەڵدەگرێت، رای بەرامبەرەکانیشم هەڵەن بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە راست بن )).

ئیمامی(مالك) یش دەڵێت:((**لا تحسم الخلف ، دع الناس وما اختلفوا**)). واتە: جیاوازی کۆتایی پێ مەهێنن‌و یەکلایی مەکەنەوە، واز لە خەڵکی بێنن لەو شتانەی لەگەڵ یەکدیدا جیاوازن، مێژوی ئیسلامیش چەندین لاپەڕە و هەڵوێستی گەشی رێزگرتن لە جیاوازی تێدایە .

گفتوگۆکاری سەرکەوتوو ئەوەیە کە قسەکان لەم خاڵانەوە دەست پێ بکات‌و هەر لە سەرەتاوە جیاوازیەکان نەوروژێنێت، بۆئەوەی مەسەلەی گەیشتن بە چارەسەرێکی هاوبەش و کەمکردنەوەی جیاوازی و ناکۆکیەکان ببێت بە هەوڵی هاوبەشی هەردوولا یاخود سەرجەم لایەنە بەشداربوەکانی گفتوگۆکە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێ کرد قورئان بانگەشەی خاوەن کتێبەکانی دیکە دەکات بۆ رێك کەوتن لەسەر کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش کە ئاینە ئاسمانیەکان تیایدا هاوبەشن.

٥ – جوان گوێ گرتن :

گفتوگۆکاری سەرکەوتوو دەبێت گوێ گرێکی سەرکەوتوو بێت، چونکە بەهۆی جوان گوێ گرتنەوە دەتوانێت بە جوانی لە مەبەستی بەرامبەرەکەی تێبگات و بزانێت چۆن بیر دەکاتەوە ، هەروەها قسەی پێ نابڕێت و بەمەش رێزی خۆی لای ئەو زیاتر دەکات و ئامادەیی زۆرتر دەبێت بۆ پێکهاتن.

٦ – دەست پێکردن لە گرنگترینەوە:

گفتوگۆکاری سەرکەوتوو لە شتە گرنگەکانەوە دەست پێ دەکات و کاتی خۆی و بەرامبەرەکانیش بە سەرقاڵ بوون بە مەسەلە لاوەکیەکانەوە لەسەر حسابی بابەتە گرنگەکان ناکوژێت، بۆنمونە پێغەمبەرانی خودا( سلاوی خوایان لێ بێت ) کاتێك نەتەوەکانیان بۆلای ئاینی خودا بانگهێشت کردووە

له بیروباوەڕەوە دەستیان پێ کردووە چونکە بناغەی شتەکانی دیکەیە:((...اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ...)) **(الاعراف٥٩و٦٥و٧٣و٨٥)**. واتە: خودا بپەرستن و جگە لەو هیچ خودایەکی دیکەتان نیە.

٧- ڕێزگرتن لە ڕاستی:

**مرۆڤ لەکاتی گفتوگۆدا بە تایبەتیش لە کاتی گفتوگۆی بیرمەندیدا دەبێت ڕێز لە ڕاستی بگرێت با لەسەر زمانی بەرامبەرەکەشیەوە دەر بکەوێت، ئیمامی شافیعی لە وتەیەکدا لەم ڕووەوە دەڵێت:((مشتومڕی زانستیم لە گەڵ هەر کەسێك کردبێت لە خودا پاڕاومەتەوە کە هەق بە زمانیدا بێت))، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە گفتوگۆکاری هەق ویست مەبەستی شکاندنی بەرامبەرەکەی نیە بەڵکو مەبەستی گەیشتنە بە ڕاستی و ڕێز لێگرتنیەتی.**

٨ - دوور کەوتنە لە ڕاناوی (من):

**مرۆڤ تا بۆی بکرێت دەبێت لە کاتی گفتوگۆدا خۆی زۆر لە بەکارهێنانی ڕاناوەکانی منو ئێمە بپارێزێت چونکە بەربەست لە نێوان خۆیو لایەنی یاخود لایەنەکانی بەرامبەردا دروست دەکات وە وێنەیەك دەخاتە ڕوو کە تەنها ڕای خۆت بەلاوە شتە و زۆر بایەخ بە ڕای بەرامبەر ناداتو دەشتەوێت ئەم ڕایەی خۆت بسەپێنیت، خودای گەورە لە ڕەچاوکردنی ئەم جێکەوتەوە هەمیشە جەختی لەوە کردۆتەوە کە پێغەمبەرانی خودا مرۆڤێکن وەك هەر مرۆڤێکی دیکە، تەنها ئەوەیە خودا پەیامی خۆی بۆیان ڕەوانە دەکاتو لە پێگەی خۆ بەبەرز گرتنیشەوە نەهاتوون بیروباوەڕی خۆیان بەسەر خەڵکدا بسەپێنن، یاخود بە چاوی نزم سەیریان بکەن.**

**پرسیار:**

**١. بۆچی پێویستە پەنا بەرینە بەر گفتوگۆ و بە ڕێبازی سروشتی ناکۆکی و کێشەکانی دابنێین؟**

**٢. بڕوابوونی کەسێك بە گفتوگۆ چ کاریگەریەك دەکاتە سەر بیرکردنەوە و ڕەفتاری ؟**

**گفتوگۆ :**

**ئایە بڕوابوون بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ بەرامبەرەکاندا یەکسانە بە بەرگری لە خۆ نەکردن کاتێك هێرش دەکرێتە سەر گەل و وڵات ؟**

## وانەی هەژدەم

## هەندێك بۆچوونی دژ بە بنەماکانی گفتوگۆ

هەروەك باسمان كرد لەگەڵ ئەوەشدا كە گفتوگۆ بەهایەکی ئیسلامیو شارستانیە، وە ڕێگەی سەرکەوتنی گەلانی موسوڵمانو سەرجەم گەلانی دونیایە بەرەو لوتکەی شارستانی و پێشکەوتن بەڵام سەرەڕای ئەوە بەهۆی خراپ تێگەیشتن لە ئیسلامو، هەندێك دەقی قورئان و فەرمودە، كێشە سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتییەکانو، زۆر داری سیستمی سیاسی لە چەندین وڵاتی ئیسلامیداو دواکەوتووی بیرەوە، چەندین بیروڕا و بۆچوونی نامۆ بە گیانی ئیسلام و بنەماکانی گفتوگۆ، لە ناو بەشێك لە موسوڵماناندا بڵاو بۆتەوەو، زیانێکی گەورەشیان لە کۆمەڵگەکانیانو ئیسلامیش داوە. كە ئەو بۆچونانەش لە بیروباوەڕی، بەکافر کردنی خەڵك و توندڕەویدا بەرجەستە دەبنو ئێمەش لە خوارەوە بە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەین.

**یەکەم - بەکافر کردن:**

بەکافر کردن (**تكفير**)ی موسوڵمان بە یەكێك لە مەسەلە مەترسیدارەکان دادەنرێتو بیرکردنەوەیەکی لەم جۆرەش جگە لەوەی لەگەڵ بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ناگونجێت، پێچەوانەی گیانی گفتوگۆیە.

### مانای بەکافر کردن:

بەکافر کردن واتە دابڕینی ئاوەڵناوی (کفر) بەسەر موسوڵمانێکدا شایەتی هێنابێت، لەسەر بناغەی بیروباوەڕێك، وتەیەك یاخود کردارێك کە لێوەی دەبینرێتو دەردەچێت.

### حوکمی بەکافر کردنی موسوڵمان لە ئیسلامدا :

هەروەك گوتمان ئیسلام بیری بەکافر کردنی موسوڵمان ڕەتدەکاتەوەو لە چەندین ئایەتو فەرمودەشدا ئەم قەدەغە کردنە بە جوانی بەرجەستە بوە و باس کراوە:

١. خودای گەورە دەفەرموێت:(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا... ))(**النساء٩٤**) واتە: ئەی باوەڕداران کاتێك چوون بۆ جەنگ لە پێناو خودادا شتەکان لە یەکدی جیابکەنەوە و بەرچاو ڕونانە مامەڵە بکەن، یەكێك لە مەیدانی جەنگدا سەلامی لێ کردن ئێوە تۆمەتباری مەکەن بەوەی لە ترساندا ئەوە دەکاتو ڕاست ناکات و باوەڕدار نیە ، ئایە ئێوە بەدوای دەستکەوتی دونیاییەوەن (یاخود ڕێنوێنی کردنی خەڵك). لەم ئایەتەدا خودای گەورە ڕێنوێنی باوەڕداران دەکات هەرکەسێك خۆی بە موسوڵمان داناو موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد ئاوەڵناوی کوفری مەخەنە شوێن و بە کافری دامەنێن.

٢. پێغەمبەر (دخ) لە فەرمودەیەکدا و بە مەبەستی هۆشیار کردنەوەی موسوڵمانان بۆ خۆپاراستن لە تاوانی بەکافر دانانی موسوڵمان دەفەرموێت :(( مَن رَمى مؤمناً بِكُفرٍ فَهُوَ كَقَتْلِه )) واتە: هەر کەسێك تۆمەتی کوفر بداتە پاڵ باوەڕدارێك وەك ئەوە وایە کوشتبێتی، کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی بەکافر دانانی موسوڵمانێك.

له سۆنگەی شوێنکەوتنی ڕێبازی ئیسلامو دەست گرتن بە ڕێنوێنیەکانی پێغەمبەری ئیسلامیشەوە(دخ) هاوەڵانی پێغەمبەر خۆیان دەبوارد لە بەکافر دانانو بە فاسق دانانی موسوڵمانان و هەموو ئەوانەی کەعبە بە قیبلەی خۆیان دەزانن، لە ( ئەبو سوفیانە) وە دەگێڕینەوە گوتویەتی: بە (جابری کوڕی عبدالله)م گوت: ئایە ئێوە بە هیچ کەسێکتان لەوانەی روو دەکەنە قیبلەو موسوڵمانن گوتووە کافر؟ گوتی: نەخێر، گوتم ئەی پێتان وتووە: هاوبەشی بۆ خودا پەیداکەر ( **مشرك** ) ؟ گوتی: پەنا دەگرم بە خودا.

## مەترسیەکانی بەکافر کردن

بەکافر کردن چەندین ئاسەواری خراپی لیٚ دەکەوێتەوە هەر بۆیە ئیسلام قەدەغەی کردووە، لەو ئاسەوارانەش :

١. پارچە پارچە کردنی کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان. لە ڕێی ئاژاوەو فیتنە نانەوەو بڵاوکردنەوەی بوغز و کینە و تەنانەت هەندێك جار کوشتنو تیرۆر و خوێنڕشتنیشەوە، لەکاتێکدا ئیسلام نەهی کردووە لە فیتنەو بوغزو رقو کینە.

٢ . لاوازکردنی ئازادی بیر و بیروڕا بەتایبەتیش بۆ زانا و بیرمەندەکان، لە ترسی تۆمەتی بەکافر دانان، ئەمەش وا دەکات هەندێك خەڵکی نەزانو کەم شارەزا لە ئیسلام بکەونە فتوادانو گومڕاکردنی خەڵك.

**پرسیار :**

بۆچی بەکافر دانانی موسوڵمان لە ئیسلامدا قەدەغە کراوە ؟

**گفتوگۆ :**

چۆن دەیسەلمێنیت بەکافر کردن لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا ناکۆکە ؟

## وانەی نۆزدەم

### ئاینی جولەکە( اليهودية )

ئاینی جولەکایەتی  کە لە رووی مێژووییەوە ئاینی نەوەکانی ئیسرائیل( **بني اسرائيل**) بووە، یەکێکە لە سێ ئاینە گەورە ئاسمانیەکە.

**نەوەکانی ئیسرائیل**: نەوەکانی ئیسرائیل دەگەڕێنەوە سەر ابراهیم پێغەمبەر(دخ) کاتێك ئەو زاتە کوڕێکی بوو ناوی نا ( اسحاق) ئەویش کوڕێکی بوو ناوی نا (یعقوب) بەڵام (یعقوب) ی کوڕی اسحاق ناوێکی تریشی هەبوو کە ئەویش ( اسرائیل) بوو، بۆیە ناوی بەنی ئیسرائیل یاخود ئیسرائیلیەکان بەسەر کوڕەکانیدا بڕا، هێندەی نەبرد ژمارەی بەنی ئیسرائیلیەکان زۆر بوو لە هەوڵیشیاندا بۆ دۆزینەوەی لەوەڕگا و سەرچاوەی ئاوی باشتر، روویان کردە میسرو لەوێ نیشتەجێ بوون.




کنیشتێکی جولەکەکان

میسریەکان ئەو کاتە بت پەرست بوونو خواوەندی جۆراوجۆریان دەپەرست ترسیان لە زۆربوونی ژمارەی عیبریەکان و جیاوازی بیروباوەڕ و ئاینەکەیان لێ نیشت، فیرعەونی دەسەڵاتداری میسر رۆژێك پیاوە ئاینی و زەیوانەکانی کۆ کردەوە ، بۆ رووبەڕوو بونەوەی ئەو مەترسیە پیاوە ئاینییەکان پێشنیاریان بۆ فیرعەون کرد بیانکاتە کۆیلە بۆ ئەوەی وەك میسریەکان بیر بکەنەوە و بێنە

سـەر ئاینەکـەیان، فیرعـەونیش پێشـنیارەکەی پەسـەند کـرد . بـەم جـۆرە عیبریـەکان وردە وردە لـە بیروباوەڕی یەکتا پەرستی، کە لە حەزرەتی ئیبراهیمەوە وەریان گرتبوو لایاندا و، جۆرەها رواڵـەتی فرەخـودایی و بتپەرسـتیان تێکـەڵ کـرد، بـەڵام سـەرەڕای ئـەوە زۆر تێکـەڵ میسـریەکان نـەدەبوون و بەردەوامیش ژمارەیان زیادی دەکرد، بۆیە فیرعەون لە سەر راوێژی پیاوە ئاینیەکان بڕیـاری دا هەموو منداڵێکی کوڕیان دوای لەدایك بوون لە ناو ببرێت و کچەکانیشیان شـوو بـە میسـرییەکان بکـەن و بـەم جۆرە لە ناو میسرییەکاندا بتوێنرێنەوە.

## لە دایك بوونی موسا

لەم کاتەدا موسا پێغەمبەر(دخ) لە دایك بوو، دایکی توانی سێ مانگ لە چاوی پیاوەکانی فیرعەون بیشـارێتەوە دواتـر لەلایـەن خـوداوە سروشـی بـۆ کـرا منداڵەکـەی بخاتـە سـندوقێکەوەو بیـدا بـەدەم روباری نیلەوەو کاری بەسەریەوە نەبێت((إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى ﴿٣٨﴾ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ... ﴿٣٩﴾))(**طه ٣٨-٣٩**)، موسا پێغەمبەری خـودا رزگارکـەری بـەنی ئیسـرائیل لـە نزیـك کۆشـك و سـەرای فیرعـەون گیرسـایەوە. هاوسـەری فیرعـەون بینـی و چـوو بـە دڵیـدا و تـوانی مێردەکەی قایل بکات نەیکوژێت، هیواشـی خواسـت عیـبری نـەبێت وگـەورەی بکـات و ببێتـە روناکـی چاوی، بەم جۆرە ژیانی حەزرەتی موسا(دخ) دەستی پێ کـرد و لـەناو کۆشـکی فیرعەونـدا گـەورە بـوو، رۆژێك موسا یەکێك لەو میسریانەی بینی، کە بۆ چاودێری کۆیلە عیبریەکان دانرابوو، زۆر بـە دڵڕەقـی لە دوو کۆیلەی عیبری دەدا، ئەویش خۆی پێ نەگیراو لە میسرییەکەی داو ئـەویش لـە ئەنجامـدا مـرد، دواتر کارەکە ئاشکرابوو حەزرەتی موسا(دخ) ئەو ناوچەیەی بەجێ هێشت بە مەبەستی دەرچـوون لـە میسـر، گەیشـتە بیابـانی مەدیـەن لـە دەوروبـەری کەنـداوی عەقەبـە، لـەوێ لـە مـاڵی ( شـوعەیب) پێغەمبەر(دخ) ماوەی (٨) ساڵ مایـەوە و یـەکێك لـە کچەکانی ئەویشـی کـرد بـە هاوسـەری خـۆی، لـە شەوێکی ساردی تەڕو توشدا موسا(دخ) لەلایەن خودای پەروەردگارەوە ئاگـادار کرایـەوە کـە ئـەوی بە پێغەمبەر هەڵبژاردووە، بۆ دڵنیابوونیشی هەر ئەو شەوە چەند موعجیزەیەکی نیشاندا.

خودای گەورە فرمانی بە موسا کرد بچێت بۆلای فیرعەون و بانگی بکات بۆ بیروباوەڕی یەکتاپەرستی، ئەویش داوای کرد ( هارون) ی برای لە گەڵدا بێت و پشتی بگرێت، موسا رۆیشت بۆلای فیرعەون و داوای رزگار کردنی گەلەکەی کرد لە کۆیلایەتی و ئازادکردنیان لە پەرستنی ئەو خودایەی باوەڕیان پێیەتی، فیرعەون گوتی خوداکەت کێیە ؟ ((قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى ))( **طه ٤٩** )

ئەویش وڵامی دایەوە: (خودای جیهانیانە)(( وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ))

( **الاعراف ١٠٤**)، ئەویش گوتی: من ناوی خوداوەندی لەو جۆرەم نەبیستووە، من خوداوەندی هەموو خوداوەندەکانم لەبەر ئەوە رێگە بە رۆیشتن و ئازادبوونی (بەنی ئیسرائیل) نادەم و دەبێت وەکو کۆیلەی من و گەلەکەم بمێننەوە.

حەزرەتی موسا موعجیزەکانی خۆی نیشاندا، بەڵام فیرعەون هەر باوەڕی نەهێنا، فیرعەون سزای سەر بەنی ئیسرائیلیەکانی زیاد کرد، موسا فیرعەونی ئاگادار کردەوە لە سەرەنجامی خراپی کردەوەکانی و تۆڵەی پەروەردگار، بەڵام بێ سوود بوو، بەڵام دوای چەندین موعجیزەو گۆڕانکاری سەرەنجام فیرعەون رازی بوو رێگە بە بەنی ئیسرائیل بدات بچنە دەرەوە، کاتێك کۆچیان کرد بە فیرعەون راگەیەنرا کە خشڵ و زێڕێکی زۆری میسریەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە.

فیرعەون بە خۆی و سوپاکەیەوە شوێنیان کەوت و لەبەر دەم دەریای سور پێیان گەیشت، لەوێدا خودا بە هانای بەنی ئیسرائیلیە لێقەوماوەکانەوە هاتوو دەریاکەی بۆ کردنە وشکانی و موسا و قەومەکەی پەڕینەوە فیرعەون و سەربازەکانیشی لە ئاوەکەدا خنکان. لاشەی مۆمیاکراوی ئەو فیرعەونە خنکاوەش تاوەکو ئێستا لە مۆزەخانەدا پارێزراوە.

## دە ئامۆژگاریەکەی حەزرەتی موسا( بە پێی تەورات )

حەزرەتی موسا(دخ) پێش ئەوەی بمرێت دە ئامۆژگاری جووەکانی کرد بۆ ئەوەی ببێتە رێبازی ژیانیان، کە ئەوانیش بریتی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە:

١ – جگە لە خودا (یەهوا) هیچ شتێکی دیکە بە خوداوەند مەزانن.

٢ – هیچ بت و پەیکەرێك مەپەرستن.

٣ – ناوی (یەهوا) مەکەنە مایەی گاڵتە و گەپ، (بەناوی یەهوای پەروەردگارتەوە بە ناشیرینی مەدوێ).

٤ – رۆژی حەوتەمی هەموو هەفتەیەك پشوو بدەن و بە پیرۆزی بزانن ( کە رۆژی شەممە یە رۆژی دەستبەتاکی و پەرستنی خودایە).

٥ – رێز لە دایك و باوکتان بگرن.

٦ – خەڵکی مەکوژن .

٧ – لە رێبازی راستەقینە لا مەدەن (زینا مەکەن).

٨ – دزی مەکەن.

٩ – سوێندی درۆ مەخۆن و گەواهی درۆ مەدەن.

١٠ – ئێرەیی (حەسودی) بە خەڵك مەبەن و خۆزگەش بۆ ئەوە مەخوازن کە هەیانە.

## کتێبی پیرۆزی جولەکەکان

( تەورات) کتێبی پیرۆزی جولەکەکانە که بە گوێرەی باوەڕی ئێمەی موسوڵمانان لە بنەڕەتدا پەیامی خودایەو لە ئاسمانەوە بۆ موسا پێغەمبەری خودا نێردراوە .

بەڵام پیاوانی ئاینی جولەکە کتێبە پیرۆزەکانیان بەم جۆرە دابەش کردووە:

**پەیمانی کۆن** (**العهد القديم**): کە لای جولەکەو مەسیحیەکان پیرۆزە وبریتییە لە کۆمەڵێك شیعرو پەخشانو حیکمەتو پەندو چیرۆكو ئەفسانەو فەلسەفەو تەشریعو لاوانەوە، ئەمەش دابەش دەکرێت بە دوو بەشەوە.

١ – **تەورات**: کە (٥) ئەسفار لە خۆ دەگرێت: بەدیهاتن (التكوين) چوونەدەر( الخروج) ( اللاوين) هەواڵەکان (الاخبار) ژمارە (العدد) ستایش کردن (التثنية) کە پێیان دەوترێت ئەسفاری موسا .

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەو تەوراتەی بۆ موسا رەوانە کرابوو لە کاتی وێرانکردنی پەیکەرەکەدا لە سەردەمی هێرشی پادشای بابلی ( بەختی نەسردا) ون بوو ، و سەر لەنوێ نوسرایەوە و بەوەش وەکو خۆی نەما و شتی دیکەی تێکەڵ بوو.

٢ – **ئەسفاری پێغەمبەران**، کە دوو جۆرە:

ئـ – ئەسفاری پێغەمبەرە پێشینەکان: یەشوع، یوشەعی کوڕی نون، قازیەکان، موتیلی یەکەم، سامۆئیلی دووەم، پادشاکانی یەکەم، پادشاکانی دووەم.

ب – ئەسفاری پێغەمبەرە پاشینەکان: ئەشقیا، إرمیا، حەزقیال، هوشەع، یوئیل، عاموس، عوبدیا، یونس، میخا، تاحوم، حەبەقەووق، سەفەنیا، حەججی، زەکەریا، مەلاخی.

هەندێك کتێبی دیکەشیان هەیە کە بریتین لە:

١ – نوسراوە مەزنەکان: مەزامیر ، زەبور ، پەندەکان ، پەندەکانی سلیمان ، ئەیوب .

٢ – پێنج بەرگەکە:(نشيد الانشاد)،راعوون، مەراسی، مەراسی ارمیا (الجامعة)، ( استير).

٣ – کتێبەکان: عەزرا، نەحەمیا، هەواڵی رۆژەکانی یەکەم (أخبار الأيام / الأول)، هەواڵەکانی رۆژگاران دووەم (أخبار الأيام / الثاني).

## هەندێك بیروباوەڕی دیكەیان

١ - پێیان وایە ئەو منداڵەی كە خودا داوای لە ئیبراهیم كرا سەری ببڕێت ئیسماعیل نیە بەڵكو ئیسحاقی كوڕی سارایە.

٢ - شتێكی وا دەربارەی زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی‌و پاداشت‌و سزای ئەو ڕۆژە لە ئاینەكەدا نەهاتووە تەنها ئاماژەیەكی كەم نەبێت كە بەشێك لەوەش لە ژێر كاریگەری ئاینی زەردەشتیدا وەریان گرتووە.

٣ - پاداشت و سزا دانەوە لەم دونیایەدا دەبێت ، پاداشت بریتییە لە پشتیوانی و سەركەوتن ، سزاش بریتییە لە دۆڕان و سەرشۆڕی و بە كۆیلە بوون .

٤ - پێویستە هەموو جولەكەیەك لە ساڵێكدا سێ جار حەج بكات بۆ (قدس) لە جەژنەكانی (فصح) و(الأسابیع) و(المظال) یەكێك لە سروتەكانی حەجەكانیش بریتییە لە پێشكەش كردنی قوربانیەكی برژێنراو بۆ پەیكەر ( الهیكل).

٥ - تابوت: بریتییە لەو سندوقەی كە بەبەهاترین سەروەت‌و سامان‌و بەڵگەنامەو كتێبەكانی تێدا دەپارێزن.

٦ - كوشتارگە (المذبح): شوێنێكە تایبەت بۆ داگیرساندنی بوخور لەپێش ئەو پەردەیە دانرێت كە لە بەردەم تابوتەكەدایە.

٧ - پەیكەر (الهیكل): بریتییە لەو باڵەخانەیەی (داود) فەرمانی پێ كردو حەزرەتی (سولەیمان) دروستی كرد، لە ناوەوەیدا میحرابی دروست كرد(واتە پیرۆزی پیرۆزییەكان)(قدس الأقداس) هەروەها شوێنێكی لە ناودا ساز و ئامادە كرد بۆ دانانی (تابوت)ی پەیمانی پەروەردگار.

٨ - كەهانە (كهانة): تایبەتە بە كوڕەكانی لیفی (یەكێك لە كوڕەكانی یعقوب) تەنها ئەوان مافی لێكدانەوەی دەقە پیرۆزەكان‌و پێشكەش كردنی قوربانیان هەیە، لە باج بەخشراون‌و كەسێتیەكانیان ئامرازن بۆ نزیك بوونەوە لە خودا، بەم جۆرەش وایان لێ هات لە پادشاكان بەهێزتر بن.

٩ - قوربانیەكان ( القرابین) : قوربانی مرۆیی لە پاڵ گیانلەبەر و بەروبوم دەگرێتەوە، دواتر خوداوەند بەبەشێك لە مرۆڤ وازی هێنا ئەویش ئەو بەشەیە كە لەكاتی خەتەنە كردندا لە لەشی مرۆڤ دەبڕدرێت‌و جولەكەكان تا ئەمڕۆش لە پاڵ بەروبوم‌و ئاژەڵ دەستیان پێوە گرتووە.

١٠ - بیرۆكەی (دوناندۆن)یش كە لە تلمودا هەیە لە هیندییەكانەوە دزەی كردۆتە ناو ئاینەكەو حاخامەكانی بابل تێكەڵ بە بیروباوەڕەكەیان كردووە.

١١ - ئاینەكەیان بەسەر خۆیاندا داخراوە و بۆ كەس نیە ببێتە جولەكە.

١٢ - منداڵی گەورە یەكەم كەسە میرات دەگرێت‌و بەشی دوو لە براكانیشی هەیە، لە میراتیشدا جیاوازی لە نێوان منداڵی شەرعی‌و نا شەرعی نیە.

**١٣ – دوای ژن هێنان ئافرەت دەبێت بە بەشێك لە موڵكو ماڵی پیاو، ماڵەكەشی دەبێت بەماڵی ئەو، بەڵام بەهۆی زۆری كێشە و ململانێ لەم روەوە دانیان بەوەدا نا كە ژنەكە خاوەنی ماڵەكەی بێت بەڵام سود و بەروبومەكەی بۆ پیاوەكە بێت.**

**١٤ – هەركەسێك تەمەنی بگاتە (٢٠) ساڵ و ژنی نەهێنابێت شایستەی نەفرینی خودایە، فرە ژنیش بە رەهایی رێگەی پێ دراوە، رەبانیەكان بە چوار ژنیان دیاری كردووە، بەڵام (القرآون) ـەكان رەهایان كردووەو سنوریان بۆ دانەناوە.**

**پرسیار :**

**لەوەی لەم وانەیە باسكرا، ئایە ئاینی جولەكە لە سەردەمی موسا (دخ) وەك ئاینی جولەكەیە لەم سەردەمەدا؟.**

# ناوەڕۆك


| ز | بابەت | ژمارەی لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| ١- | پێشەکی | ٣ |
| | وەرزی یەکەم | |
| ٢- | بەشی یەکەم-باوەڕ | ٦ |
| ٣- | وانەی یەکەم – باوەڕ ناسی | ٧ |
| ٤- | وانەی دووەم – باوەڕو بەختەوەری | ١٠ |
| ٥- | وانی سێیەم – باوەڕو تێڕوانین بۆ بوونەوەر | ١٤ |
| ٦- | وانەی چوارەم - باوەڕو راستی پشت بەستن بە خودای گەورە | ١٨ |
| ٧- | وانەی پێنجەم – پشت بە خودا بەستن و پشت بەخۆ بەستن | ٢٢ |
| ٨- | بەشی دووەم – رەوشت | ٣١ |
| ٩- | وانەی شەشەم – پێگەی رەوشتی جوان لە ئیسلامدا | ٣٣ |
| ١٠- | وانەی حەفتەم – پێغەمبەر ( د.خ )سەرمەشقی مەزن | ٣٦ |
| ١١- | وانەی هەشتەم – هەندێك لە خەسلەتەکانی رەوشت لە ئیسلامدا | ٣٩ |
| ١٢- | وانەی نۆیەم – هۆیەکانی پەروەردەکردنی رەوشتی | ٤٢ |
| | وەرزی دووەم | |
| ١٣- | بەشی سێیەم – ئیسلام ومافەکانی مرۆڤ | ٤٧ |
| ١٤- | وانەی دەیەم – ئیسلام ومافەکانی مرۆڤ | ٤٩ |
| ١٥- | وانەی یازدەم – دەستە بەرییەکانی ئیسلام بۆ مافی ئاسایشی تاکەکەس | ٥٢ |
| ١٦- | وانەی دوازدەم | ٥٤ |
| ١٧- | وانەی سێزدەم | ٥٨ |
| ١٨- | وانەی چواردەم | ٦٠ |
| ١٩- | وانەی پازدەم | ٦٢ |
| ٢٠- | وانەی شازدەم | ٦٧ |
| ٢١- | بەشی چوارەم – بەها ئیسلامییەکان | ٧١ |
| ٢٢- | وانەی حەڤدەم – بەها ئیسلامییەکان | ٧٣ |
| ٢٣- | وانەی هەژدەم – هەندێك بۆچوون دژ بە بنەماکانی گفتوگۆ | ٧٨ |
| ٢٤- | بەشی پێنجەم - ئاینەکان - ئاینی جولەکە ( اليهودية ) | ٨١ |
| ٢٥- | وانەی نۆزدەم - ئاینی جولەکە ( اليهودية ) | ٨٣ |
| ٢٦- | ناوەڕۆك | ٨٩ |